لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد




# زمانی کوردی

## لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا



دوکتۆر
ئەورەحمانی حاجی مارف

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد - بەغدا

له چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

# زمانی کوردی
## له بەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا


دوکتۆر
ئەورەحمانی حاجی مارف



چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد - بەغدا
١٩٧٦

# پێشەکی

ئاخاوتن بۆ لە یەکتر گەیشتنە و بریتییە لە نیشانە • ئەو نیشانانە لە ئاخاوتندا ــ دەنگ و لە نوسیندا ــ پیت پێکیان دەهێنن • لەبەر ئەوە لێکۆڵینەوە لە دەنگەکانی زمان بەشێکی گرنگ و پێویستی زمانناسییە • ئەم بەشەش پێی دەوترێ ( فۆنەتیک ــ Phonetics ) [1] •

جا بەم جۆرە دەتوانین بڵێین فۆنەتیک بەشێکە لە زانستی زمان و دەربارەی دەنگەکانی ئاخاوتنی مرۆڤ دەدوێ و لە سیستێم و یاسایان دەکۆڵێتەوە •

هەرچەندە زانایانی پێشینی هیند و یۆنان لە جودا کردنەوە و لێکدانەوە و دابەش کردنی دەنگەکانی ئاخاوتندا ئەنجامێکی گەورەیان وەدەست هێنا ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا فۆنەتیک یەکسەر جێی خۆی لە زانستی زماندا وەرنەگرت و ، دەتوانین بڵێین لە ماوەی داهاتودا زمانناسی تا ڕادەیەك لە ڕوی دەنگەوە زمانی فەرامۆش کرد ، بە مەرجێك ئەگەر کارەکانی ( کوردیموا )ی فەرەنسەیی ــ سەدەی حەڤدە و ( یو • کریژانیچ ، م• ڤ• لۆمۆنۆسۆڤ )ی ڕوسی ــ سەدەی هەژدە و هەندێکی دیکەی لێ

---

(١) فۆنەتیك Phonetics ــ لە وشەی ( Phone ) ی یۆنانییەوە وەرگیراوە کە بە واتای « دەنگ » دێت .

دەرکەین •••••• خۆ لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا هێشتا زانایان باش دەنگ و پیتیان لێك جودا نەدەکردەوە [٢] •

بەڵام بەدەم زۆژگارەوە ئەم زانستە کەوتە بڕەو و لێکۆڵینەوەی فۆنەتیك بە شێوەی تاقی‌کردنەوە هاتە کایەوە •••• بەهۆی ئامێری دەنگ تۆمارکردنەوە ، توانرا نەك بە تەرازوی بیستن ، بەڵکو بە تەرازوی وەك تەرازوی زێڕینگەر ـ کە ئەویش شریتی تایبەتییە ، جیاوازی و وێکچوونی دەنگەکان ئاشکرا بکرێن •

لە سەرێکی‌ترەوە فیزیا و فیزیۆلۆژی و زانستی توێکەری ( ئانەتۆمی ) و تیۆری ئاواز و گۆڕانی هاریکاری ئەو زانستە کۆرپەیە ـ فۆنەتیك ـ یان کرد • لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا دەستکەوتی تەجروبەی فۆنەتیك بە جۆرێك بۆ ، کە توانی یارمەتی تەواوی لێکۆڵینەوە بدا و ئەو نائاشکراییەی لە پێك‌هاتنی دەنگەکانی زماندا مابۆنەوە ساغ بکاتەوە و فۆنەتیك وەك زانستێکی گرنگ بخاتە پێش چاو •••••• لە ئەنجامی ئەم پێشکەوتن و گەشە کردنەی تیۆری فۆنەتیکدا ـ« فۆنێم **Phoneme** )) [٣] دۆزرایەوە •

بۆ نەپچڕاندنی یەکیەتی زمان و تۆژینەوە لە چۆنیەتی دەنگ وەك دیاردەیەکی هێز تەماشا نەکرا ، بەڵکو وەك دیاردەیەکی کۆمەڵ هەڵسەنگێنرا • ئەم تێگەیشتنە لە زێی تیۆری فۆنێم و فۆنۆلۆژییەوە هاتە ناو زانستی زمانەوە •

لەم ڕووەوە ، لەکاتی خۆیدا ئەریستۆ نوسیویە : « نەك هەمو دەنگێك ، بەڵکو تەنیا دەنگی تەواو ماکە ، واتە ـ دەنگێك کە وشەیەکی لە هۆش

(٢) ڕیفۆرماتسکی ، سەرەتایێکی زمانناسی ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ ، ل ١٥٣ـ١٥٤ .
(٣) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٠٨ .

هەڵێنجراو دروست دەکا • دیارە کە ئاژەڵیش خاوەنی دەنگە ، بەلاَم من ئەو جۆرە دەنگانە بە ماك دانانێم »[٤] •

زماناسانی نیوەی دووەمی سەدەی نـۆزدە کێشەی پێویسـتی جودا کردنەوەی دەنگە سەرەکییەکانیان هاتە پێش • بۆ نموونە زانای ڕوس ـ پ• لـ• ئۆسـلاَر لە سالاَنی ٧٠ی سـەدەی نۆزدەدا ، کاتێـك خەریکی لێکۆڵینەوەی زمانـەکانی ناوچە شاخاوییەکانی سـەروی قەفقاس بو ، بەو نیازەی لەسەر بناغەی ئەلفوبێی ڕوسیی توسین بۆ ئەو میللەتانە ساز بکا ، ئەوەی ئاشکرا کرد کە لە زماندا دو جۆرە دەنگ هەیە • جۆری یەکەمیانی ناونا دەنگی چۆنەکی **Lautqualitaten** ، و جـۆری دووەمیان دەنـگی چەندەکی **Lautquantitaten** • جۆری یەکەم ـ ئەوانەن کە دەوترێن و مانا دەگۆڕن و وشەیەك لە وشەیەك جودا دەکەنـەوە ؛ جۆری دووەم ـ ئەوانەن کە هەرچەندە دەوترێن ، بەلاَم مانا ناگۆڕن و وشـە لە یەك جـودا ناکـەنەوە[٥] •

ئەو هەمو دەنـگە زۆر و جیاوازانەی لە زمانەکانی جیهانـدا هەن و هەروەها هونـەر و توانـای بێ سنوری مـرۆڤ لە دەربڕینیانـدا ئەوە دەچەسپێنن ، کە ئەندامەکانی ئاخاوتنی مرۆڤ چاکترین ئامێری دەنگن •

سەرچـاوەی پەیدابونی دەنـگ لای مرۆڤ تەنیـا « ئەندامەکانی ئاخاوتن » ( ڕشتەی هەناسە ، ئەوك ، زمانە بچکۆلە ، زمان ، دەم ، لێو ، لوت •••• ) نییە ، بەلکو هەندێ ئەندام هەن کە بە پێی یاسای فۆنەتیك لە ڕیزی « ئەندامەکانی ئاخـاوتن »دا دانانـرێن ، یاخود لە ڕیـزی چالاکا ناژمێررێن ، وەك ئەو ئەندامانەی لە پەیـدابونی : ( پرخەپرخ و نزگەرە و قڕقێنە و قۆڕەی سك •••••• )ەوە دەور دەبینن و دەریان دەبڕن •

---

(٤) لە هەمان سـەرچاوەوە وەرگیراوە ، ل٢٠٨ •
(٥) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٠٩ •

له زانستی زماندا لەم ڕووەوە پرسیارێك دێتە ناوان : ئایا دەکرێ ئەو جۆرە دەنگانە بە فۆنەتیك دابنرێن ؟ .

ئەم پرسیارە ، دەکرێ بە دوو جۆر وەڵامی بدرێتەوە :

یەك ـ نەخێر . چونـــکە وەك دیاردەیـــەکی سروشتی هەمـــو ئەو ( پرخەپرخ و نزگەرە و قڕقێنە و قوڕەی ســـك .... )ە خاوەنی مانایەکی چۆنەکی نین .

دوو ـ بەڵێ . چونـــکە دەتوانرێ ئەو دەنگانە وەك نیشـــانە بەکار بهێنرێن .

کاتێ مرۆڤ ڕوو لە ئاژەڵ و پەلەوەر دەکا ، یا بۆ بەجێهێنانی کارێك دەنگێکی وەك : ( فیکە ) دەردەبڕێ ، کە لـــە کاتی ئاوخواردنەوەی ئاژەڵدا بۆی لێ دەدا ؛ ئەو فیکەیە واتایەکی تایبەتی دەگەیێنێ . هەروەها ئەو دەنگەی لە کاتی دان ڕۆکردنا بۆ مریشك و کەڵەشێر دەری دەبڕێ،دەنگی بانگ کردنە بۆ مەبەستی دان خواردن . (کۆکین)یش وەك نیشانەیەك کە بڵێ بێدەنگ بە یاخود دەست پێبکە ...... ئەمانە و چەنـــد دەنگی دیکەی لەو جۆرە لە ئاخاوتنی مرۆڤدا نیشانەی دەنگی واتادارن(٦) . بەڵام لە هیچ بارێکەوە لـــە ڕیزی (چالاك)دا دانانرێن .

بە داخەوە دەربارەی فۆنەتیکی زمانی کوردی تاکو ئێستا بە شێوەیەکی زانستی و تاقیـــکاری لێکۆڵینەوە کەمە ، هەر لەبەر ئـــەو هۆیەشە ، گەلێك کێشەی ئەم زانستە ئاڵۆزە و ، بیر و باوەڕی جیاواز زۆرە(٧) . لێرەدا ئەوە

---

(٦) ئا. ئا. ڕیفۆرماتسکی ، فۆنەتیـــکی بێیاسا ، « پێشـــکەوتنی فۆنەتیکی زمانی ڕووسی ئەمڕۆ » ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل ٩٦ ـ ٩٧ .

(٧) شیکردنەوەی گەلێـــك کێشـــەی ئەم زانستە و بیر و بـــاوەڕی جیاواز دەربارەی ، لە زۆر شوێنی ئەم کتێبەدا هاتووە .

دەخەمە ڕوو کە منیش ئەم باسەم لە سەر بناغەی ئەزموون نەنووسیوە ، بەڵکو کەرەستەکەی تەنها هەندێ سەرنجن کە داومن و چەند بەراوردێکن کە کردوومن و لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی ئەو کارانەن کە لەم ڕووەوە نووسراون •••• وەك ئاشکرایە ، بۆ کێشەیەکی وەها گرنگ ئەوەی لە دەستم هاتووە زۆر کەمە و بێشك ئەوەش هۆی کەم و کورتیی باسەکەمە •

نیمچە شارەزاییەك لە مەسەلەی فۆنەتیکدا و هەڵسەنگاندنی ئەوەی هەر لە زووەوە تاکو ئەمڕۆ لەبارەی فۆنەتیکی زمانی کوردییەوە نووسراوە، چوونە ناو زمانەکە خۆیەوە و لێکدانەوە و شوێنکەوتنی •••••• ئەو ڕێگەیەی بۆ خۆش کردم کە ئەوەی دەربارەی فۆنەتیکی زمانەکەمان ڕاست و زانستییانە نووسراوە بسەلمێنم و بچەسپێنم و ، ئەوەی هەڵە و چەوتیشە لای بەرم و دووری بخەمەوە •••••• هیچ گومانم لەوەدا نییە ، کە ئەم کارەی من تەواو نییە و کەم و کورتیی تێدایە • بەڵام ئەوەندەش هەیە ، ئەم کتێبە سەرەتایەکە لەبارەی کێشەی فۆنەتیکی زمانی کوردییەوە• واش بزانم توانیومە، هەرچەند کەمیش بێ ، هەندێ زانیاریی نوێ تۆمار بکەم و مشتێك بخەمە سەر خەرمانی فۆنەتیکمان •

• بێگومان ، لە لێکۆڵینەوەی گشت ڕوویەکی زماندا ، بەر لە هەر شتێك چوونە ناو زمانەکە خۆیەوە ، کاری هەرە گرنگ و پێویستە ، چونکە وەك ئاشکرایە هەر زمانێك خاوەنی گەلێك تایبەتیی خۆیەتی • بە وێنە یەکێك لەو تایبەتییانە ئەوەیە ، ژمارەی دەنگی بزوێن و کۆنسۆنانت لە زمانانی جیاوازدا وێك ناچن ، وەك لەو خشتەیەی خوارەوەدا(٨) دەبینین :

---

(٨) لە دیاریی کردنی دەنگی بزوێن و کۆنسۆنانتی ئەو زمانانەی لە خشتەکەدا ڕیز کراون ، سوودم لە هەندێ لەو لێکۆڵینەوە نوێیانە وەرگرتووە کە لە بارەیانەوە نووسراون . جا ئەگەر کەم و زۆرییەك لەو ڕووەوە هەبێت ، ئەوە بۆ سەرچاوەکە دەگەڕێتەوە . بە وێنە من خۆم لە زمانی عەرەبیدا
=

| زمــان | کۆنسۆنانت | بزوێن | دۆلانە | سەرپاك |
|---|---|---|---|---|
| کوردی | ٢٨ | ٨ | ٣ | ٣٩ |
| عەرەبی | ٢٨ | ٣ | — | ٣١ |
| ئینگلیزی | ٢٤ | ١٣ | ٣ | ٤٠ |
| فەرەنسەیی | ١٧ | ١٨ | — | ٣٥ |
| ڕۆسی | ٣٤ | ٥ | — | ٣٩ |
| ئەڵەمانی | ١٨ | ١٥ | ٣ | ٣٦ |
| ئەبخازی | ٦٨ | ٣ | — | ٧١ |
| فینی | ١٤ | ١٦ | — | ٣٠ |

لە گەلێك زماندا وا ڕێك دەکەوێ ، هەندێ دەنگ لە سەرەتای وشەوە نایەن • هەر بــەو جۆرەش لە زمانی کوردیدا ئەو دیاردەیــە بەدی دەکرێ • بە وێنە لە زمانی کوردیدا دەنگی ( ر ) و ( ڵ ) لە سەرەتای وشەدا بەکار ناهێنرێن •

لە زمانی کوردیــدا دوو دەنگی ( ل ، ڵ ) بە هیــچ کلۆجێك

=
پسـپۆڕ نیم و ناتوانم ژمارەی دەنگەکانی دیاری بکەم ، لەبەر ئەوە پەنام بردۆتە بەر چەنــد لێکۆڵینەوەیەکی باوەڕ پێ کــراوی نوێ ، بەتایبەتــی کتێبی : ( محمد الانطاكي ، الوجيز في فقه اللغة ، حلب ، ١٩٦٩ ) . بۆ بەشێکی زۆریش لەو زمانانــە ( ئینگلیزی ، فەرەنســەیی ، ئەڵەمانی ، ئەبخازی ........ ) کەڵــکم لــە کتێبــی ( ئــا. ئــا. ڕێفۆرماتسکی ، سەرەتایێکی زمانناسی ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ؛ ١٩٦٧ ) وەرگرتووە ...... هتد .

هەڵناگرن بخرێنە پێش دەنگی ( ر ، ڕ )ەوە ، یاخود بە پێچەوانەشەوە کورد ( ر ) لە پێش ( ل )ەوە ناهێنێ[9] . بەلام مەرج نییە لە زمانانی دیکەدا ئەم تایبەتێتییە هەبێ .

لە زۆر زماندا ، ئەگەر لە دوای دەنگێکی **( ئاوازەدار )**ەوە دەنگێکی **( کپ )** بێت ، ئەوسا دەنگە کپەکە کار دەکاتە سەر دەنگە ئاوازەدارەکەی بەر دەمی و وەك خۆی دەیکاتە دەنگێکی کپ ــ واتە دەیهێنێتە ڕیزی ئەو پۆلە دەنگانەی کە خۆی یەکێکە لەوان . بە وێنە ، لە زمانی ڕۆسیدا دەنگی ئاوازەداری **( د ، ز ، ژ ، ڤ ، گ .... )** کە دەکەونە پێش دەنگێکی کپەوە ، کپ بە دەما دێن ــ واتە دەبن بە **( ت ، س ، ش ، ف ، ك .... )** .هەرچەندە ئەم دیاردەیە تێکڕا لە زمانی کوردیدا وەك ڕۆسی نییە بەلام بە شێوەیەکی کەم و سست ئەم ڕوداوە لە فۆنەتیکیدا دەبینرێ . بەتایبەتی ئەگەر لە پاش دەنگی **( ز ) و ( ژ )**ەوە دەنگی **( ت )** هەبێت ، ئەوە دەکرێن بە **( س ) و ( ش )** ...... زمانی ئەوتۆش هەیە ئەم دیاردەیە نایگرێتەوە و دەنگی ئاوازەدار هەمیشە بە ئاوازەداری دەمێنێتەوە .

یەکێك لەو تایبەتییانەی زمانی کوردی لە گەلێك زمان جودا دەکەنەوە ، ئەوەیە کە دەنگی **( ل ) و ( ڵ )** دوو فۆنێمی سەربەخۆن و دەنگی **( ر ) و ( ڕ )**ش هەر بەو جۆرەن ..... کەچی لە هەندێ زماندا ، بە وێنە لە زمانی ڕۆسیدا **( ل ) و ( ڵ )** یەك فۆنێمن و ، **( ر ) و ( ڕ )**ش هەر بەو چەشنە ...... هتد .

وەك وتمان ، هەر زمانێك خاوەنی تایبەتی خۆیەتی و هەندێ خاسیەت

---

(٩) بڕوانە : پەراوێزی ژمارە (٧٣ ، ٧٤) .

زمانان لە یەك جودا دەكەنەوە • جا ئەو چەند نموونە كەمەی سەرەوەش ئەوە دەردەخەن و ڕادەگەیەنن كە زمـــانی كوردیّ خاوەنی گەلێك خاسیەت و تایبەتیّ سەربەخۆی خۆیەتی •

زۆر پێویستە دوو مەفهوومی ( **دەنگ** ) و ( **پیت** ) لێك جودا بكرێنەوە • دەنگ لە ڕێگای ئەندامەكانی ئاخاوتنەوە دەردەبڕدرێت و بە هۆی بیستنەوە هەستی پێ دەكـــرێ • پیت وێنەی دەنگە كە بە نیشانە لـــە نووسیندا دیار كراوە و بە هۆی بینینەوە وەردەگیرێ • ئەم دوو مەفهوومە جیاوازە نابێ وەك یەك تەماشا بكرێن و بە یەك شت بدرێنە قەڵەم •

بەداخەوە ، زۆر جار نەك تەنیا لە نێو كۆمەڵی ڕوناكبیراندا ، تەنانەت لەناو هەندێك لە شارەزایانی زمانی كوردیشـدا ئەو تێكەڵ كردنە دەبینرێ • هەر لەبەر ئەو هۆیەشە هەندێ لەوانەی لە نووسینی كوردییان كۆڵیوەتەوە دەنگ و پیتیان لێك جیا نەكردۆتەوە • بەشێك لەوانەی لە ڕێزمانی كوردیّ دواون ڕەگی هەندێ كاریان بە هەڵە نیشان داوە[١٠] •

نووسین دەستـكەوتێكی مـــەزنی ئادەمیزادە و پەیدابـــوونی سەرەتای مێژووی شارستانییەتە • نووسین لە ژیانی گەلاندا و لە ژیانی تێكڕای كۆمەڵ و هەر یەك لە ئەندامانیدا دەورێكی گەورەی بینیوە و دەبینێ و كارێكی زۆری تێ‌كردووە و تێ‌دەكا • لەبەر ئەوە لێكۆڵینەوە لە مێژوو و سەرەتا ، ڕێباز و شێواز ، پێـــكهاتن و كاركردن ، ناتـــەواویّ و كۆسپ ، پێشـــكەوتن و گەشەكردن •••••• ی نووسین كارێكی مەزن و پێویست و بە سوودە • لەم ڕێگەیەوە دەتوانرێ گەلێك كێشەی گرنگ چارەسەر بكرێ • بێ‌گومان نووسینی كوردیّ كـــە سەراپای پاشاگەردانییە چاوەنـــواڕی لێكۆڵینەوەی

---

(١٠) پتر لەوە گرنگیّ نەدان بە فۆنەتیك ، ڕێگای تێگەیشتنی نوســـینی ئەمڕۆ گران دەكا ، لێكدانەوەی ڕاستی ڕێزمان سەخت دەكا .

قوڵ و تیر و تەسەلە ، چاوە چاوی باسێکیە کە لە گشت ڕۆیەکی بدوێ و بە بیر و باوەڕی ڕاست و زانستانە گیر و گرفتەکانی نەهێڵێ ..... ئاشکرایە ، چۆن ئاو و هەوا کەرەستەی هەرە پێویستی ژیانی مرۆڤن ، هەروەها دەتوانم بڵێم سەرچاوەی سەرەکیی نووسینیش ، فۆنەتیکە . چونکە لە سەر بناغەی فۆنەتیك و ، لە ڕێگای یاسا تایبەتییە سروشتییەکانی فۆنەتیکەوە دەتوانرێ گەلێ کێشەی ئاڵۆز و نائاشکرای نووسین خاوبکرێنەوە و چاریان بۆ بدۆزرێتەوە[11] .

وەنەبێ دەنگەکانی ئاخاوتن هەر بۆ نووسین سەرچاوە بن ، بەڵکو بەر لە هەموو شتێك کەرەستەی خودی ئاخاوتنەکەن . ئاخاوتنی مرۆڤ لە دەنگ پێك هاتووە و دروست بووە . دەتوانرێ بوترێ ، ئاخاوتنی مرۆڤ تەنیا لە دەنگ پێك نەهاتوە ، بەڵکو بریتییە لە وشە و هەروەها ڕستەش . ڕاستە هەموو ئەمانە : ڕستە ، وشە ، دەنگ ..... پارچە و کەرەستەی پێکهێنەری ئاخاوتنی مرۆڤن . بەڵام دەنگەکانی ئاخاوتن جێگەیەکی هەرە دیار و تایبەتییان هەیە لە ناویاندا . دەنگیش بچووکترین دانەی زمانە و ئەم ماکەی زمان بە سەر پارچەی لە خۆ بچووکتردا دابەش نابێ[12] .

لە هەر ڕۆیەکی زمانی کوردیی وردبینەوە ، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە پێویستی بە دەیان لێکۆڵینەوە و توێژینەوە هەیە .... یەکێك لەو مەودایانەی کاریان کەم تێدا کراوە فۆنەتیکە . بینینی ئەو کەلێنە هەستی جووڵاندم و ڕایکێشام کە خۆم بەو باسەوە خەریك و ماندوو بکەم . دوای

---

(١١) لە سەرەتادا نیازم وا بوو ، باسی (فۆنەتیك) و (نووسین) بە یەك کتێب بڵاوبکەمەوە . چونکە ئەو دوو باسە بە تەواوی پێکەوە بەستراون و ئێجگار تێکچڕژاون ، بەڵام وا هاتە پێشەوە کە بیانکەمە دوو کتێبی سەربەخۆ . جاری ئەوە کتێبی یەکەمیان پێشکەش بە خوێنەرانی بەڕێز دەکەم ! .. هیوادارم کتێبی دووەمیش زۆری پێ نەچێ ..

(١٢) ئا. ئی. مەیسێیف ، پیت و دەنگ ، لێنینگراد ، ١٩٦٨ ، ل ١٨ .

هەوڵ و کۆششێکی زۆر ، ئەوەی بۆم کـرا کردم و ئەوەی لە توانامدا بو بەجێم هێنا .

ئەرکی سەرەکی ئەم کتێبە **« زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا »** تۆژینەوە و لێکـۆڵینەوە لەو کێشـە گرنگانەیە کە لـە ڕووی فۆنەتیکەوە پەیوەندییان بە دەنگەکانی زمانی کوردییەوە هەیە ، بەتایبەتی وەك :

**( فۆنیم ، شێوەی فۆنیم ، دەنگی بزوێن ، دەنگی کۆنسۆنانت ، نیمچە بزوێن ، دەنگی دۆلانـە ، ئەندامەکانی ئاخاوتن ، خاسیەتی فۆنەتـیکی زمانی کوردی ، بەراورد لە نێوان فۆنەتیکی دیالێکتی کرمـانجی ژوورو و خـوارودا ، بڕگە ، هێز ...... هتد ) .**

بە پێویسـتی دەزانم ، پەنجە بۆ ئـەوە ڕابکێشم ، کە لـە گۆڤاری ڕازاوەی **« بەیان »**دا زنجـیرەیەك وتارم بە ناوی « لە بارەی فۆنەتیکی زمانی کوردییەوە » بڵاوکردەوە (۳۱) ، کە هەنـدێ بوون لە کەرەستەی ئەم کتێبە . بەڵام بەداخەوە ، گەلێك هەڵەی چاپی وای تیکەوت بیر و ڕاکانمیان شێواندبو .

شایانی باسە مامۆستا مەسـعود محەمەدیش گەلێك تێبینی و سەرنجی بەنرخی لە بارەی ئەم کتێبەوە خستە ڕوو . من لە کاتێکدا بۆ پوختکردنی باسەکە سوودێکی زۆرم لە بیر و ڕاکانی وەرگرتوە(۱٤) پڕ بە دڵ سوپاسی دەکەم .

---

(۱۳) بڕوانە : گۆڤاری «بەیان» ، ژ ۱۲ ، ل ۱٤ ، ۲٦–۲۷ ؛ ژ ۱۳ ، ل ۲–٤ ؛ ژ ۱٤ ، ل ۱۳–۱٥ .

(۱٤) بەتایبەتی ، وەك : ڕاست کردنەوەی هەندێ باس کە من تیایاندا بەهەڵەدا چووبووم ؛ ڕوونکـردنەوەی ئـەو شوێنانەی نوسـینەکە کە تـا ڕادەیەك تێگەیشتنیان ئاسان نەبوو .......

سەرەڕای ئەوانـەش زانیـاری بەنرخی وای داومـەتێ کە من زووتـر نەمزانیون ، وەك ( دەربارەی ئەو نوسراوانەی نزیك گردی «شمشارە»ی =

له ئاخی دڵەوە سوپاسی مامۆستا هێمن موکریانیێ و مامۆستا شوکور مستەفا و مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم و مامۆستا عەبدوڵڵا حەسەن زادە دەکەم ، کە لە دەرکردنی ئەم کتێبەدا زۆریـــان هاریکاریێ لەگەڵ کردم و یاریدەیان دام • هــەروەها ڕێز و سوپاسم بۆ کرێــکاران و لێپرسراوی چاپخانەی کۆڕ ، کە بە ڕاستیێ دڵسۆزانە ئەم کارەیان بۆ هەڵسوڕاندم •

ئەگەر بەم کــارە توانیبێتم خزمەتێکی بچــوك پێشکەش بە زانیاریێ گەلەکەمان بکەم و لە بارەی فۆنەتیکی زمانی کوردییەوە چەند وشەیەکی بە کەڵك بنوسم ، ئەوە ئاواتم بەجێهاتووە و مایەی بەختەوەریمە •

**د. ئەوڕەحمانی حاجیێ مارف**

★ ★ ★

---

=

لای ڕانیــە دۆزراونەتــەوە ....... ) ؛ یاخــود کێشــەی وای بــۆ لێكداومەتەوە کە لای من زۆر ڕۆن نەبووە ، وەك (هەندێ ڕۆی نیمچە بزوێنەکان ....... ) •

ئەو جۆرە تێبینی و سەرنجە بەنــرخ و بەسوودانە و گەلێکی دیکە لە نرخاندنەکەی مامۆســتا مەسعوددا خرابونــە ڕو ........ هەروەها بە پێویستی دەزانم لێرەدا سەرنج بۆ ئەوەش ڕابکێشم ، کە بەداخەوە وا ڕێکەوت لە چەنــد شوێنێکی کەمدا ڕامان وەك یــەك نەبێ ، بە وێنە ( مامۆستا لەو ڕایەدایە کە لە وشەکانی ( gir ) ‘ ( dil ) ‘ ( kiç ) .... دا قورس‌کردن Stress هەیە ، بەڵام ئەوە بە لای منەوە کورتە بزوێــنی ( i ) ە . نرخێنەر گومانی لــەوەدا نییە کە ( یێ ) فۆنێمە ، هەرچی نوسەری ئەم کتێبەیە ، وەك لــە پەراوێزی ژمارە ٣٢ دا باسی کردووە ، دەربارەی ئەم دەنگە ڕایەکی تایبەتیی هەیە ..... و هەندێکی تر ) •

## فۆنەتیــك

( Phonetics علم الأصوات )

فۆنەتیك بەشێکە لــە زانستی زمان ، دەربارەی دەنــگەکانی زمان دەدوێ و لە سیستێم و یاسایان دەکۆڵێتەوە •

## فۆنێــم

( Phoneme الوحدة الصوتیة )

ئاخاوتنی ئێمە لە وشە پێك هاتووە کــە خاوەنی مانان • بە وێنە لەم ڕستەیەدا « نــەژاد کوڕێکی زیرەکە » ــ سێ وشە هەیــە و هەر یەکەیان خاوەنی مانا و واتای خۆیەتی و لەگەڵ وشەکانی تردا جیاوازێ هەیە • هەر وشەیەك لەمانە لە چەند دەنگێك پێك هاتووە ، بە وێنە : وشەی **((نەژاد))** ــ بریتییە لە پێنج دەنگ : ( ن ، ە ، ژ ، ا ، د ) • هەر یەك لەو دەنگانە کە توانای جیاکردنەوە و گۆڕینی مانای وشەی هەیە ، لە زانستی زماندا بە ( **فۆنێم** Phoneme ) ناسراوە •

مرۆڤ نەك تەنها دەتوانێ وشە بە دەمدا بێنێ ، بەڵکو هەروەها دەتوانێ بیشینوسێ ، یاخود چاپی بکات • کاتێ ئێمە دەنوسین یاخود چاپ دەکەین ، ئەوە وێنەی دەنگەکانی ئاخاوتن بە پیت(١) نیشان دەدەین •

فۆنێم ( Phoneme ) بەو دەنگانە دەوتــرێ کە لە زماندا وشە پێك دەهێنن و ، بە گۆڕان و لاچونیان واتا دەگۆڕێن • بۆ نمونە ، ئەگەر

---

(١) پیت : وێنەی دەنگەکانی ئاخاوتنە .

فۆنێمی ( ا ) لە وشەی « **باز** »دا بگۆڕێت بە ( **ە ، ۆ ، ێ** ...... )
ئەوە ئەم وشانە « **بەز ، بۆز ، بێز** .... » پەیدا دەبن ، کە جیاوازییەکی تەواو لە مانایاندا هەیە ــ واتە لێرەدا فۆنێمی ( **ە ، ۆ ، ێ** .... ) دەوری گۆڕینی مانای وشەی « **باز** » دەبینن • ئەگەر فۆنێمی ( **ز** )یش لە وشەی « **ناز** »دا بگۆڕرێت بە ( **ن ، ڵ ، ف ، خ** ..... ) ، ئەوە ئەم وشانە : « **نان ، ناڵ ، ناف ، ناخ** ..... » دروست دەبن ، کە هەر یەکەی مانای تایبەتی خـۆی هەیـە ــ واتـە بەم جـۆرە دەبینین کـە فـۆنێمی ( **ن ، ڵ ، ف ، خ** ..... ) مانای وشەی « **ناز** » دەگۆڕن •

لێرەدا پێویستە سەرنج بۆ ئەوەش ڕابکێشین ، کە هەرچەندە فۆنێم کاری جیاکردنەوە و گۆڕینی مانا بەجێ دەهێنێ ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خۆی بە تەنیا خاوەنی مانا و واتا نییە •

## شێوەی فۆنێم Allophone (٢)

پێویستە ئەوەش لە بیر نەکەین کـە درێژی و مامناوەندێتی و کورتی وتنی دەنگەکان نابن بـە هۆی جیاوازی فـۆنێم • بـە وێنە ئەگەر فۆنێمی ( ا ) لە وشـەی « **شار** »دا کورت یـا درێژ تلفظ بـکەین ، مانای وشەکە ناگۆڕێ و بەمە دەڵێن **شێوەی فۆنێم** **Allophone** • بەڵام ئەگەر فۆنێمی ( ا ) بکەین بە ( ێ ) ، ئەوە وشەیەکی نوێ « **شێر** » دێتە کایـەوە ، کە لەگەڵ وشـەی « **شار** »دا مانایان جـیاوازە و ئەو دەنگەش کـە ئـەو دەورە دەبینێ فۆنێـم ( Phoneme )ی پێ دەڵێن •

---

(٢) وشـەی Allophone لە پێشـگری ( allo ــ شێوەی جیاواز ) و وشـەی ( phone ــ دەنگ ) پێکهاتووە . بـەم جۆرە وشـەی Allophone بەمانای ــ شێوەی فۆنێم ــ دێت .

به چەند دەنگێك کە لە یەك فۆنێمدا کۆدەبنەوە ، ( واتە ــ دەربڕینی یەك فۆنێم بە چەند جۆرێك ) دەڵێن شێوەی فۆنێم • لەبەر ئەوەی شێوەی فۆنێم لە ئاخاوتندا ناتــوانێ دەوری گۆڕین و جیاکردنەوەی مانــای وشە ببینێ ، بۆیەکا زۆر سەرنجی قسەکەر و گوێگر ڕاناکێشێ •

بەشێك لە شێوەی فۆنێم ئەوانەن کــە بەتایبەتی بــە شێوە و جۆری تلفظی کەســانی جیاوازەوە بەســتراون • یاخود هەر یــەك کەس ، بەلام بە گوێرەی شوێن و پێویست تلفظی خۆی دەگۆڕێ • بە وێنــە (١) دەتوانرێ بەرز یا نزم ، درێژ یا کورت تلفظ بکرێت ، یاخود دەبینین هەمو کەس وەك یــەك دەنگی (ش) تلفظ ناکــەن • جگە لەوە ئــەم جۆرە شێوانەی فۆنێم لە زمانی کوردیدا ، بە هۆی بونی دیالێکت و بەشە دیالێکتی جیاوازەوە زۆر بەر گوێ دەکەون • بــۆ نمونە ، لە شــێوەی هەوراماندا بەر گوێ دەکەوێ ، کە دەنگی ( س ) وەك ( ث ) و ، دەنگی ( ز ) وەك ( ذ ) تلفــظ دەکــرێ • ناوچــەی کۆیــە و خۆشــــناوەتی و دزەییــاتی و گەردییایەتی (ڵ) دەکەن بە (ر) ، شاری هەولێر دەیکا بە (ل) ، لە سلێمانی وشەی «دەربەند» دەکرێ بە «دەربەنگ»• بەلام ئەمانە هیچیان مانای وشە ناگۆڕن و فۆنێم نین • ئەو جۆرە شێوەیەی فۆنێم کە لە سەرەوە لێی دواین لە فۆنەتیکدا پێی دەوترێ شێوەی فۆنێمی تایبەتی •

بەشێکی دیکە لە شێوەی فۆنێم ، ئەوانەن کە بە هۆی جێگە و شوێن و کارکردنی دەنــگی ترەوە ، شێوەی دەنگێکی تایبەتییــان وەرگرتووە و هەمیشە بەو جۆرە تلفظ دەکرێن • بە وێنــە ( گ ، ك ) لەپێش ( ی ، ێ ، وێ ، وی )دا دەگۆڕێت • شێوەی تلفظیان وەك ( چ ) یاخود ( ج )ی لێ دێت • واتــە ( گ ) و ( ك ) کە لە حالەتی ئاساییدا لە بنی ئەکەوە

تلفظ دەکرێت ، بەلاّم لە حالّەتی دووەمدا زمان نزیك مەلاّشوَ دەخاتەوە[٣] .

هەروەها **( ت )** کە دەکەوێتە پێش بزوێنەوە بە تەوژمێکی بەهێز دەردەبڕێت ، وەك : **( تا ، تە ، توَ ... )** ، وە کە دەکەوێتە کوّتـایی وشەوە تەوژمی لاواز دەبێت ، وەك : **( پـەت ، ڕەت ، جـوَت .... )** .

لە زانستی زماندا بـەم جوّرە شێوەیەی فوّنیم دەڵێن : شێوەی فوّنیمی پەیوەند . Dependent ( conditioned ) Allophone

## دەنگەکانی زمانی کوردیَ

دەربارەی فوّنـەتیکی زمانی کـوردیَ تاکو ئێستا بە شـێوەیەکی زانستیَ و ئەزموّنیَ لێکوّڵینەوە کەمە ، هەر لەبەر ئەو هـوّیەشە ، گەلێـك کێشەی ئەم زانستە ئاڵوّزە و بیر و باوەڕی جیاواز لە بارەیەوە زوّرە.لە بەشی فوّنەتیکی ئەو ڕێزمانانەی لە زوَدا دەربارەی زمـانی کوردیَ نوَسراون لـە دیارکردنی ژمـارەی دەنگــە بزوێنەکـان ( Vowels ) و کوّنسوّناتەکـان ( Consonants ) دا ئەنجامێکی یەكگرتوَیان نییە . بوّ نموّنە دەبینین ژمارەی دەنگە بزوێنەکان لای ف. یوَستیَ[٤] و س. یەگیزاروّف[٥] نزیکەی (١٥) ، لای ی. سوّن[٦] و ر. جاردین[٧] (١٠)ن .

---

(٣) شیکردنەوەی ئەم تایبەتێتییە ، و گەلێکـی دیکـە بە شـێوەیەکی فراوان لەم کتێبـەدا هاتووە .

(٤) F. Justi, Kurdishe Grammatik, S - bg, 1880, pp. 1 - 102.

(٥) س. ئا. یەگیزاروّف ، مێژوّیەکی ئەتنوّگرافیَ کورتی کوردی پارێزگای یەریڤان ، « هەواڵەکانی لقـی قەفقاسـیای کوّمەڵی جـوگرافیَ ڕوّسیَ ئیمپراتوّریَ » ، تفلیس ، ١٨٩١ ، ب ١٣ ، ژ ٢ .

(٦) E. B. Soane, Grammar of the Kurmanji or Kurdish Language, London, 1913, pp. 1 - 5.

(٧) R. F. Jardine, Bahdinan Kurmanji; Grammar of the Kurmanji of the Kurds of Mosul division and Surrounding districts of Kurdistan, Baghdad, 1922, pp. vl - vll.

دانانی ئەلفوبێی لاتینی لە ساڵی (١٩٢٩)دا بۆ کوردی سۆڤێت[٨] و لە ساڵی (١٩٣٠ ــ ١٩٣١)دا بۆ کوردی سوریا ، هەنگاوێکی گەورە بوو لە دیارکردنی دەنگە بزوێنەکان و کۆنسۆنانتەکاندا . هەرچەندە لە دانانی ئەو دوو ئەلفوبێیەدا پەیوەندی نەبووە و هەر یەکە بە شێوەیەکی سەربەخۆ دانراوە (ئەلفوبێی کوردی ئەرمەنستان لەسەر بنچینەی ئەو ئەلفوبێ لاتینییە وەرگیرابوو کە بۆ نوسینی زمانی کەمایەتییەکانی یەکیەتی سۆڤێت دانرابوو ، ئەلفوبێی کوردی سوریاش لە سەر بنکەی ئەلفوبێی لاتینیی تورکی دانرابوو) بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەی پیتە بزوێنەکان لەم دوو ئەلفوبێیەدا یەك بوون ــ ئەویش هەشت دەنگن کە دیارییان کردووە[٩] .

لەم دوو ئەلفوبێیەدا ژمارەی پیتە کۆنسۆنانتەکان یەك نین . لە ئەلفوبێی کوردی سوریادا ــ (٢٥) و ، لە ئەلفوبێی کوردی ئەرمەنستاندا ــ (٣٠) پیت دیاری کراوە . هۆی ئەم جیاوازییەش ئەوەیە کە لە ئەلفوبێی کوردی سوریادا هەندێ دەنگیان بە (فۆنێم ــ Phoneme ) نەژماردووە . ئەمەش وەنەبێ هۆی ئەوە بێ کە بەشە دیالێکتی کوردی ئەرمەنستان خاوەنی خاسیەتی خۆیەتی ، بەڵکو ئەم هەردوو بەشە دیالێکتە ( کوردی سوریا و ئەرمەنستان ــ ئەوڕەحمان ) کە سەر بە دیالێکتی کرمانجی ژوورون لە ئەندازەی دەنگی کۆنسۆنانتدا یەکیەتی تەواویان لە نێواندا هەیە . هەندێ لێکۆڵینەوەی ئەم ساڵانەی دواییش ئەو ڕاستییەیان سەلماندووە .

ب. ڤ. میللیر لە وتارێکدا کە لە بارەی فۆنەتیکی زمانی کوردییەوە

(٨) خالیدی چەتۆ ، کوردی ئەرمەنستانی سۆڤێت ، یەریڤان ، ١٩٦٥ ، ل ١١٦ ــ ١٢٠ .

(٩) ئەگەر ئەو ڕایەی کە بزوێنی دوولانە ( Diphthong ) لە زمانی کوردیدا بە فۆنێم ( phoneme ) ناژمێررێت وەربگرین ، ئەوە بێگومان ، ئەمە ڕاست دەردەچێ .

تۆسیوێتی[١٠] سەبارەت بەو دوو ئەلفوبێیە و ئەو ڕێزمانانەی لە سەرەوە ناومان بردن دواوە و لەو دەنگانەی کۆلیوەتەوە کە لە ئەلفوبێی کوردی سوریادا زۆر هەستیان پێ نەکرابو ، و لە ڕێگای زانینی خۆی و وردبونەوە لە نوسراوی نوێوە یەکیەتی نیشان داوە و سەلماندووە .

ف. س. سۆکۆلۆڤا لە کتێبەکەیدا کە لە بارەی فۆنەتیکی زمانە ئێرانییەکانەوە نوسیوێتی[١١] ، بە شێوەیەکی ڕاست و زانستی لە فۆنەتیکی شێوەی کوردی خۆراسان دواوە . لەم بەشەدا ئەو خشتەیەی هێناوەتەوە ، کە ئی. ئی. تسوکەرمان بۆ دەنگە بزوێنەکانی شێوەی کوردی ئەرمەنستان دای ناوە . ف. س. سۆکۆلۆڤا ( ٩ ) دەنگی بزوێن و (٣٠)ی کۆنسۆنانتی دەست نیشان کردووە ــ واتە ئەوەندەی لە ئەلفوبێی کوردی ئەرمەنستانی سۆڤێتدا دیارکراوە ، بە مەرجێك دەنگی ( ی ــ y ) نەژمێرێت ، کە ف. س. سۆکۆلۆڤا ئەم دەنگە لە ڕەسەندا بە کوردی دانانێ .

لە بەشی فۆنەتیکی ئەو ڕێزمانانەدا کە لەم ساڵانەی دواییدا لە یەکیەتی سۆڤێت دەربارەی زمانی کوردی نوسراون ، دەبینین ژمارەی دەنگەکانی کوردی لای قەناتی کوردۆ[١٢] و چەرکەزی بەکۆ[١٣] ــ ( ٩ ) بزوێن و

---

(١٠) ب. ف. میللێر ، لە بارەی هەندێ کێشەی فۆنەتیکی کوردییەوە ، کتێبی « زمانە ئێرانییەکان» ، ب ٢ ، مۆسکۆ ــ لێنینگراد ، ١٩٥٠ ، ل ٦١ ــ ٦٧ .

(١١) ف. س. سۆکۆلۆڤا ، لە بارەی فۆنەتیکی زمانە ئێرانییەکانەوە ، مۆسکۆ ــ لێنینگراد ، ١٩٥٤ ، ل ٧٨ ــ ١٠٣ .

(١٢) قەناتی کوردۆ (کوردۆیێف) ، ڕێزمانی زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ ، ل ١٥ .

(١٣) چەرکەزی بەکۆ ( باکایێف ) ، زمانی کوردەکانی ئازربایجان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٥ ، ل ١١ .

(٣٠) کۆنسۆناتتن و ، لای کەریمی ئەییوبێ و ئی• ئا• سمیرنۆڤا[١٤] ــ (١١) بزوێن و (٢٦) کۆنسۆناتتن •

له نوسراوەکەی د• ن• مەکەنزیدا کە دەربارەی دیالێکتەکانی زمانی کوردێ نوسیوێتی[١٥] له بەشی فۆنەتیکدا بۆ دیالێکتی کرمانجیی خوارۆ ــ (٩) و بۆ کرمانجێ ژوورۆ ــ (٨) دەنگی بزوێن دیاریکراوە و بە شێوەیەکی زانستێ لەو مەسەلەیەی کۆڵیوەتەوە • ئەوەی کەم و کورتیش بێت ، ئەوەیە کە لێك جیاکردنەوەی کورتێ و درێژیێ دەنگە بزوێنەکانی نەسەلماندووە •

ساڵی ١٩٣٢ لە شام هەرەکۆل ئازیزان[١٦] له ژێر ناوی « ڕێزمانا ئەلفابێیا کوردێ »دا نامیلکەیەکی (٢٠) لاپەڕەیی بلاوکردەوە[١٧] • ئەم نامیلکەیە بە پێنج زمان ( کوردێ ، فەرەنسەیێ ، تورکێ ، عەرەبێ ، فارسێ ) نوسراوە و له دەنگەکانی زمانی کوردێ کۆڵیوەتەوە • نوسەر (٣١) دەنگ : ( ٨ )ی بزوێن و (٢٣)ی کۆنسۆناتتی دەست نیشان کردووە •

جەلادەت عالێ بەدرخان ساڵی ١٩٥٣ کتێبێکی ڕێزمانی کوردێ بلاوکردەوە[١٨] • له بەشی فۆنەتیکی ئەم کتێبەدا ( ل ٣ــ٧٠ ) ، نوسەر بە

---

(١٤) کەریم ئەیوبێ و ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، دیالێکتی کوردی موکریێ ، لێنینگراد ، ١٩٦٨ ، ل ٨ .

(١٥)
D. N. Mackenzie, Kurdish Dialect Studies, London, 1961, pp. 1 - 30.

(١٦) میر هەرەکۆل ئازیزان ، جەلادەت عالی بەدرخانە .

(١٧)
Mîr Hereqol Azîzan, Rêzana Elfabêya Qurdì, çapxana Tereki, Şam, 1932.

(١٨)
Celadet Bedir - Khan, Grammaire Kurde, Paris, 1953.

دۆر و درێژێ لە دەنگەکانی زمانی کوردێ و لـە چۆنیەتێ دەربڕینیان ...
کۆڵیوەتەوە . لەســەر بنچینەی ئەم کتێبە ســاڵی ۱۹۷۰ ڕۆژێ لیســکۆ
بە شێوەیەکی فراوانتر بە ناوی خۆی و جەلادەت عالێ بەدرخانەوە ، لە ژێر
ناوی « ڕێزمــانی کوردێ » ( دیـالێکتی کرمـانجێ ژۆرۆ )دا کتێبێکـی
بڵاوکردەوە[19] . لە بەشی فۆنەتیکی ئەم کتێبەدا ( ل ۱ــ۶۰ ) بە شێوەیەکی
زانستێ و فراوان لە گەلێك کێشەی گرنگ و پێویست دواون .

تۆسەرانی ئەم دۆ کتێبە ( ۸ ) دەنگی بزوێنیان دیاری کردوە و هەروەها
خشتەیەکی باشی شێوە و چۆنیەتێ دەربڕینــی دەنگــە بزوێنەکانیان نیشان
داوە[20] .

ڕەشید کورد لەو کتێبی ڕێزمانەیدا کــە ساڵی ۱۹۵٦ لە شام بڵاوی
کردۆتەوە[21] ، لە دەنگەکــانی زمــانی کوردێ دواوە ( ل ۹ ــ ۱۵ ) و لە
ئەنجامدا (۸) دەنگی بزوێن و (۲۳)ی کۆنسۆنانتی دیارکردووە .

ساڵی ۱۹۳۳ مامۆســتا تۆفیق وەهبی لە بارەی زمــانی کوردییەوە
نامیلکەیەکی (٤٤) لاپەڕەیی بڵاوکردەوە[22] ، کە بە شێوەیەکی گشتێ باسی
چەشن و کاری پیتــەکان و چۆنیەتێ تۆسینی کوردێ بــە لاتینێ دەکات .
لێرەدا تۆسەر (۸) دەنگی بزوێن و (۲۵) دەنگی کۆنسۆنانتی دەست نیشــان

---

(۱۹)
Emir Djeladet Bedir Khan et Roger Lescot, Grammaire Kurde ( Dialecte kurmandji ), Paris, 1970.

(۲۰) ئەو خشتەیە لە کتێبی یەکەمدا لە لاپەڕە (۱۲) دایە و لە کتێبی دووەمدا لە لاپەڕە ( ۸ ) دایە .

(۲۱)
Reşîd Kurd, Rêzmana Zimanê Kurmancî, Şam, 1956.

(۲۲) تۆفیق وەهبێ ، خوێندەواری باو ، بەغدا ، ۱۹۳۳ .

کردووه • جگــه لەوه دەنگــی ( y ) یشی بە نیمچە بزوێن داناوه [٢٣] •

مامۆستا نوری عەلی ئەمین لە لاپەڕه (١١ــ١٤)ی کتێبی « ڕێزمانی زمانی کوردی »دا[٢٤] ژمارەی دەنگەکانی زمانی کوردی بــە (١٢) بزوێن و (٣٢) کۆنسۆنانت داناوه• لەو کتێبەشیا کە لە بارەی ئیملای کوردییەوه بڵاوی کردۆتەوه[٢٥] (١٢)ی بزوێن و (٣١)ی کۆنسۆنانتی داناوه •

لە کتێبەکەی مامۆستا طاهر صادقدا[٢٦] ژمارەی دەنگەکانی زمانی کوردی بە ( ٦ ) بزوێن و ( ٢٨ ) کۆنســۆنانت دراونەتە قەڵــەم • مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی لە کتێبی « فۆنەتیکی زمانی کوردی »دا ــ ( ٨ ) دەنگی بزوێن و (٢٧) کۆنسۆنانتی داناوه[٢٧] • مامۆستا مەسعود محەمەد لە وتــاری « فۆنــەتیك چیمان بــۆ بکــا ؟ »دا [٢٨] ــ (٨) دەنگی بزوێنی دیــارکردووه •••••••[٢٩] •

---

(٢٣) مامۆستا قەناتی کوردۆش لە نامەی دوکتۆرییەکەیدا دەنگی ( y ) و ( w )ی بە نیمچە بزوێن داوەتە قەڵەم .

(٢٤) نوری عەلی ئەمین ، ڕێزمانی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ .

(٢٥) نوری عەلی ئەمین ، ڕابەری بۆ ئیملای کوردی ، بەغدا ، ١٩٦٦ .

(٢٦) طاهر صادق ، ڕێنوس . چۆنیەتی نوسینی کوردی ، کەرکوك ، ١٩٦٩ .

(٢٧) محەمەد ئەمین هەورامانی ، فۆنەتیکی زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٤ .

(٢٨) مەسعود محەمەد ، فۆنەتیك چیمان بۆ بکا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی سێیەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٥٦٨ ــ ٦٢٢ .

(٢٩) مامۆستا ع. ع. شەونم لەو وتارەدا کە لە لاپەڕه ( ٣٢ ــ ٣٦ )ی ژمارە (٢)ی ســاڵی ١٩٧٠ی گۆڤــاری « برایــەتی »دا بــڵاوی کردۆتــەوه ، باسی هێندێك لەو جیاوازییانەی کردووه کە لە نێوان نوسەراندا هەیە لە دیارکردنی ژمارەی دەنگەکانی زمانی کوردیدا و لەو ڕووەوه چەند بیر و ڕایەکی دەربڕیوه .

بەم جۆرە بۆمـان ڕوون بووەوە ، کە لە دیارکردنی ژمـارەی دەنگە بزوێنەکان و کۆنسۆنانتەکانی زمانی کوردیدا ئەنجـامێکی یەکگرتو نییە و لەم بارەیەوە لە نێو زانایانی زمان و کوردناساندا بیر و ڕای جیاواز بەدی دەکرێت •

بەڵام ئەگەر ئەو دوو ڕایـە وەربگریـن کە کـورتی و درێـژی[٣٠] دەنگـی بـزوێن و ، بزوێنـی دوولانـــە ( ادغـــام حـرفي علـــة ــ Diphthong ) بە نیشانەی جیاکردنەوەی فۆنێم دانانێین لە زمانی کوردیدا ، ئەوە بە شێوەیەکی گشتی ژمارەی دەنگە بزوێنەکانی زمانی کوردی ئەبن بە (٨) ، بە مەرجێك ئەو تایبەتییە کەمەی لـە هەندێ بەشـە دیالێکتدا هـەن نەژمێررێن و، بەنیسبەت دەنگە کۆنسۆنانتەکانیشەوە، ئەگەر( و ) و ( ی )ی کۆنسۆنانت لە ڕیزیانا دابنێین ، ئەوە ژمارەیان دەبێتە (٢٨) فۆنێم •

## دەنگە بزوێنەکان

( ~~Vowles الحروف العلة~~ )
Vowel Sounds

بزوێن بەو دەنگانە دەوترێ ، کە لـە دەربڕینیاندا هەوا بێتەگەرە و بە ڕەوانی بە بۆشاییی دەمدا تێدەپەڕێ • واتـە ــ ئـەو لوزەو ( تیار )ی هەوایەی لـە سییەکانەوە دێ ، لە دەمدا هیچ کۆسـپ و بەرهەڵستێکی نایەتەڕێ •

لـە زمـانی کوردیـدا هەشـت دەنـگی بـزوێن هـەن

(٣٠) بێشك دەنگی بزوێن کە هێـزی لەسەر بێت ، هەمیشە درێژتر تلفظ دەکرێت ، وەك لەوەی هێزی لەسەر نەبێ .

( ا ، ە ، ێ ، ی ، ــ ، ۆ ، ۇ ، و )(٣١) ( a , e , ê , î , i , o , û , u )(٣٢) .
=

ئەم دەنگانە لە بارەی چۆنیەتی جوڵانەوەی زمانەوە بە شێوەی ئاسۆیی ( افقي ) دەتوانرێ دابەش بکرێن بەسەر :

**١ ــ بزوێنەکانی ڕیزی پێشەوە ــ** واتە ئەو بزوێنانەی لە کاتی تلفظ کردنیاندا زمان بەرەو پێشەوە دەچێت ــ ( ێ ) ، ( ی ) : ( î ) ' ( ê )

نموونە :

| کرمانجی خوارو | کرمانجی ژوورو | | |
|---|---|---|---|
| پێ | پێ | ( ێ ) : | ( ê ) |
| درێژ | درێژ | | |
| ئێوارە | ئێڤار | | |
| پیر | پیر | ( ی ) : | ( î ) |
| کڕین | کڕین | | |

---

(٣١) وەك ئاشکرایە ، لە ئەلفوبێی عەرەبیدا نیشانە بۆ دەنگی ( i ) نییە ، لەبەر ئەوە لە شوێنی پێویستدا شوێنیم بە ( ــ ) پڕکردۆتەوە . هەروەها لە هەندێ شوێندا بۆ دەربڕینی ئەو دەنگە ئەلفوبێی لاتینیم بەکار هێناوە .

(٣٢) لەگەڵ دەنگە بزوێنەکاندا باسی ( ێ )مان نەکردووە ، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە دەربارەی ئەو دەنگە ڕایەکی تایبەتیم هەیە و تیایدا دوودڵم و هێشتا نەگەیشتۆمەتە ئەنجامێکی تەواو .

## ٢ ـ بزوێنەکانی ڕیزی ناوەڕاست ـ

واتە ئەو بزوێنانەی لە کاتی تلفظ کردنیاندا زمان لە ناوەڕاستی دەمدا دەبێ :

( و ) ، ( ـ ) ، ( ە ) : (e) , (i) , (u)

نموونە :

| | کرمانجی ژووروو | کرمانجی خواروو |
|---|---|---|
| (u) : (و) | کوڕ | کوڕ |
| | کورد | کورد |
| | گول | گوڵ |
| (e) : (ە) | ئەڤ | ئەم |
| | دەنگ | دەنگ |
| | سەرەك | سەرەك |
| (i) : (ـ) | kirin | kirdin |
| | bira | bira |
| | bizin | bizin |

## ٣ ـ دەنگەکانی ڕیزی پشتەوە ـ

واتە ئەو بزوێنانەی لە کاتی تلفظ کردنیاندا زمان لە پشتەوە (قوڵایی)ی دەمدا دەبێ :

( ا ) ، ( ۆ ) ، ( ۊ ) : (û) , (o) , (a).

نموونه :

| کرمانجیی خواروو | کرمانجیی ژووروو | | |
| --- | --- | --- | --- |
| ئاو | ئاف | | |
| دار | دار | (ا) : | (a) |
| چرا | چرا | | |
| ڕۆژ | ڕۆژ | | |
| بۆ | بۆ | (ۆ) : | (o) |
| دۆست | دۆست | | |
| زوو | زوو | (وو) : | (û) |
| چوون | چوون | | |
| موو | موو | | |

له بارەی ڕادەی هەڵبڕین و دانەواندنی زمانیشەوە ــ واتە لە شێوەی ئەستوونیی (عمودیی) ی جووڵانەوەیدا ، دەتوانرێت دەنگە بزوێنەکانی زمانی کوردیی دابەش بکرێن بەسەر :

۱ ــ بزوێنەکانی سەروو ــ

واتە ئەو بزوێنانەی لە کاتی تلفظ کردنیاندا زمان بەرەو سەروو هەڵدەکشێ .

(ی) ، (وو) : (î) , (û) :

۲ ــ بزوێنەکانی ناوەڕاست ــ

واتە ئەو بزوێنانەی لە کاتی تلفظ کردنیاندا زمان لە ناوەڕاستی دەمدا دەبێ .

( ێ ) ، ( ۆ ) ، ( و ) ، ( ـ ) : (î) , (u) , (o) , (ê) .

**٣ ـ بزوێنەکانی خوارۆ ـ**

واتە ئەو بزوێنانەی لە کاتی تلفظ کردنیاندا زمان لە بەشی خوارۆی دەمدا دەبێ :

( ا ) ، ( ە ) : (e) , (a).

بەم جۆرە ئەوەی لە بـارەی چۆنیەتیِ جوڵانەوەی زمـانەوە لە کاتی تلفظ کردنی دەنگە بزوێنەکاندا لە سەرەوە خستۆمانەتە ڕۆ ، دەتوانرێ لەو خشتەیەی خوارەوەدا نیشان بدرێ :

| a , e , ê , î<br>i , o , û , u . | | ڕێـــز | | |
|---|---|---|---|---|
| | | پێشەوە | ناوەڕاست | پشتەوە |
| ڕادەی بەرز و نزمی | سـەرۆ | ی î | | ۆ û |
| | ناوەڕاست | ێ ê | ـ i<br>و u | ۆ o |
| | خـوارۆ | | ە e | ا a |

لەبەر ڕۆشنایی ئەو بـاسەی سەرەوەدا ـ واتە لـە ڕۆی چۆنیەتـی جوڵانەوەی زمان بەرەو پێشەوە و ڕادەی هەڵبڕین و دانانەوەیدا ، دەتوانرێ خاسیەت و ناونیشانی دەنـگە بزوێنەکانی زمانی کوردیِ بـەو شێوەیەی خوارەوە دەست نیشان بکرێ :

( ی ) : ( î )

ئەم دەنگە ، بزوێنی ڕیزی پێشەوە و بەشی سەرووە ـ واتە لە کاتی

تلفظ كردنی ئـــەم دەنگەدا زمان كە بە شێوەی ئاســۆیی ( افقي ) هاتوچۆ دەكات ــ بەرەو پێشـــەوە دەچێت و ، لە شێوەی ئەســتونی ( عمودي )ی جوڵانەوەیدا بەرەو سەرو هەڵدەكشێ •

( ێ ) : ( ê )

ئەم دەنگە ، بزوێنی ڕیزی پێشەوە و بەشی ناوەڕاستە ــ واتە لە كاتی تلفظ كردنی ئـــەم دەنگەدا زمان كە بەشێوەی ئاسۆیی هاتوچـــۆ دەكات ــ بەرەو پێشـــەوە دەچێـــت و ، لە شـــێوەی ئەســتونی جوڵانـــەوەیدا لە ناوەڕاستی دەمدایە •

( ـ ) : ( i )

ئەم دەنگە ، بزوێنی ڕیزی ناوەڕاست و بەشی ناوەڕاستە ــ واتە چ لە شێوەی ئاسۆیی هـــاتوچۆی زمـــاندا و چ لە شێوەی ئەستونی جوڵانەوەیدا زمان لە ناوەڕاستی دەمدا دەبێ •

( و ) : ( u )

هەر وەك ( ــ ) : ( i ) بزوێنی ڕیزی ناوەڕاست و بەشی ناوەڕاستە •

( ە ) : ( e )

ئەم دەنگە ، بزوێنی ڕیزی ناوەڕاست و بەشی خوارووە ــ واتە لە كاتی تلفظ كردنی ئەم دەنگەدا زمان كـــە بە شێوەی ئاسۆیی هاتوچـــۆ دەكات لە ناوەڕاستی دەمدا دەبێ و ، لـــە شێوەی ئەستونی جوڵانـــەوەیدا لـــە بەشی خواروی دەمدایە •

( وو ) : ( û )

ئەم دەنگە ، بزوێنی ڕیـــزی پشتەوە و بەشی سەرووە ــ واتە لە كاتی

تلفظ کردنی ئـەم دەنگەدا زمان کە بە شێوەی ئاسـۆیێ هاتوچۆ دەکات لە پشـتەوە ( قوڵایێ )ی دەمدایە و ، لە شێوەی ئەستونێ جوڵانەوەیـدا بەرەو سەرو هەڵدەکشێ •

( ۆ ) : ( o )

ئەم دەنگە ، بزوێنی ڕیزی پشتەوە و بەشی ناوەڕاستە ــ واتە لە کاتی تلفظ کردنی ئـەم دەنگەدا زمان کە بە شێوەی ئاسـۆیێ هاتوچـۆ دەکات لە پشتەوە ( قوڵایێ )ی دەمدایە و ، لە شێوەی ئەسـتونێ جوڵانەوەیـدا لە ناوەڕاستدا دەبێ •

( ا ) : ( a )

ئەم دەنگە ، بزوێنی ڕیزی پشتەوە و بەشی خوارووە ــ واتە لە کاتی تلفظ کردنی ئـەم دەنگەدا زمان کە بە شـێوەی ئاسۆیێ هاتوچـۆ دەکات لە پشتـەوە ( قوڵایێ )ی دەمدایە و ، لە شێوەی ئەسـتونێ جوڵانەوەیـدا لە بەشی خوارووی دەمدا دەبێ •

چۆن دەنگە بزوێنەکـانی زمـانی کوردێ لە چۆنیـەتێ جوڵانەوەی زمانـدا بەرەو پێشەوە ، دەتوانرێ دابەش بکرێن بەسەر بزوێنەکانی ڕیزی ( پێشەوە و ناوەڕاست و پشتەوە ) و ، لە بارەی ڕادەی هەڵبڕین و دانەواندنی زمانەوە بەسەر بزوێنەکانی ( سـەرو و ناوەڕاست و خوارو )دا ، هەروەها بە گوێـرەی کورتێ و درێژێ دەربڕینیـان دابەش دەبن بەسەر ئـەم دوو پۆلەدا :

١ ــ **بزوێنی کورت** ــ ( ە ، و ، ــ ) : ( e, u, i ).

٢ ــ **بزوێنی درێژ** ــ ( ا ، ۆ ، وو ، ێ ، ی ) : ( a, o, û, ê, î ).

# خاسیەتی چەند ئەندامێکی ئاخاوتن
# لە کاتی دەربڕینی دەنگە بزوێنەکاندا

لە تلفظ کـردنی دەنگە بزوێنەکاندا هەندێك لە ئەنـدامانی ئاخاوتن ( بە تایبەتی لێو و دەم ) شێوەی جیاواز وەردەگرن •

**١ ــ باری لێو :**

لە سەرێکەوە هەردوو لێو بەرەو پێشەوە دەچن و لە یەك نزیك دەبنەوە و خڕ دەبن ــ ئەمە لە کاتی تلفظ کردنی ( ۆ ، وو ، و )دا زۆر دەدات •
لە سەرێـکی دیکەوە هەردوو لێو بـەرەو تەنیشت دەکشێن و لـەم بارەدا دەنـــگەکانی ( ی ، ێ ) تلفظ دەکرێـن و ، لە دەربڕینـی ( ا ، ە ، ــ )دا لێوەکان لە یەکتر جودا دەبنەوە •

**٢ ــ ئەندازەی دەم کردنەوە :**

لەم کارەدا چەناگەی خوارەوە یـارمەتی کەم و زۆری کردنەوەی دەم دەدات • لێرەدا دەتوانرێ سێ پلە لە چۆنیەتی کردنەوەی دەمدا دەست نیشان بکرێ •

( أ ) کردنەوەی کەم ( تەنگ ) •

واتە لە تلفظ کردنی ( ی ، ــ ، و ، وو ) : ( î, i, u, û ) دا .

(ب) کردنەوەی مامناوەند •

واتە کاتێك کە ( ێ ، ۆ ، ە ) : ( ê, o, e ) تلفظ دەکرێت •

( ج ) کردنەوەی زۆر ( فراوان ) •

واتە کە دەنگی ( ا ) : ( a ) دەردەبڕێت •

## نیمچە بزوێــن

( Semi — vowel    النصف الطليق ـ )

نیمچە بزوێن بــە دەنگێك دەوترێ ، لــە حاڵەتێكدا بزوێــن بێ و لە حاڵەتێكی دیكەدا كۆنسۆنانت •

لە زمانی كوردیدا دوو نیمچە بزوێن هەیە :

١ ـ و ـ w

٢ ـ ی ـ y

ئەو دوو نیمچە بزوێنەی زمانی كوردی ، لە حاڵەتی وەستاوی (سكون)دا دەبنە بزوێن ، وەك :

( چاو ، نەوت ، ئای ، های ، دایك •••• ) •

بەڵام كاتێك حەرەكە وەردەگرن دەبنە كۆنسۆنانت[٣٣] ، وەك :

( وەرە ، ڕەوە ، یاری ، یاختی •••• ) •

## بزوێنــی دوولانــە

( Diphthong ـ ادّغام حرفي علة )

لە زانستی زماندا بە تێكەڵ بوونی دوو دەنگی بزوێن ، دەوترێ بزوێنی

(٣٣) تێكــڕای ئــەو شارەزایانــەی باسی دەنــگی ( و ، ی )یــان كردوە ، بە لای ئەوەدا نەچوون كە لە چ حاڵەتێكدا دەبنە بزوێن و چ **كاتێك** دەوری كۆنســۆنانت دەبینن •••••• بەڵام ئەوەی شــایانی باس بێت ، ئەوەیە كە مامۆستا مەسعود محەمــەد ، لــە كۆتایی وتــاری « فۆنەتیك چیمان بۆ بكا ؟ »دا ئەو كێشــەیەی ســاغ كردۆتەوە ( بڕوانە : گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد ، بەرگی سێیەم ، بەشی یەكەم ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٦١٧ ـ ٦١٨ ) •

## دۆلانە ( Diphthong ) (٣٤)

هەندێ لە کوردناسان لەو ڕایەدان کە بزوێنی دۆلانە لە زمانی کوردیدا نییــە •••• بەشــێکیش بە پێچــەوانەوە ژمارەیــەك دەنــگی وایــان :

---

(٣٤) هەروەها لە زانستی زماندا بە تێکەڵ بوونی ســێ دەنگی بزوێن دەوترێ بزوێنی سێلانە ( Triphthong ) ، وە بە تێکەڵ بوونی چوار دەنگی بزوێن دەوترێ بزوێنی چــوارلانە ( Tetraphthong ) ....... لەو ڕایەدام کە بزوێنی سێلانە و چوارلانە .... لە زمانی کوردیدا نییە . وە زوربەی هەرە زۆری کوردناسان لە سەر ئەو ڕایەن ....... بەڵام ئەوەی لەم ڕووەوە ســەرنجی ڕاکێشاوم،ئەوەیە کە مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانێ لە لاپــەڕە ( ١١ ــ ١٢ ، ٤٠ ، ٤٢ ــ ٤٣ )ی کتێبی « فۆنــەتیکی زمانی کوردێ »دا ، وای نیشان داوە ، کە لە زمانی کوردیدا بزوێنی سێلانە و چوارلانە .... هەیە . بەم بۆنەیەوە نوسیوێتی دەڵێ : « زمانی کوردێ جیاوازێ هەیە لەگــەڵ زمانــەکانی تــردا بەوەی کە چەنــد بزوێنێك کۆ دەبنەوە یەك بە شوێن یەکدا ...... » ...... « لە زمانی کوردیدا ، وەختێ وا هەیە زیاتر لە سێ دەنگ ( دەنگی بزوێن ــ ئەوڕەحمان ) لە یەك هێشــودا کۆ دەبێتەوە ...... » ( ل ٤٠ ) . نوســەر بۆ ســەلماندنی ئەو بیر و ڕایەی هەنــدێ نمونەی هێناوەتــەوە . بە وێنە : ( ەو )ی لــە وشــەی (شــەو)دا بە بزوێنی دۆلانە ؛ ( آوە )ی لە وشــەی ( ساوەر )دا بە بزوێنی سێلانــە ؛ ( آوای )ی لە وشـــەی ( ئاوایی )دا بە بزوێنی چــوارلانە ؛ ( ەوایە )ی لە وشــەی ( ڕەوایە )دا بە بزوێنی پێنجلانە داوەتە قەڵەم ... (ل ٤٣) . بەداخەوە مامۆستا محەمەد ئەمین لەمەدا بە هەڵە چووە .... هۆی ئەو بە هەڵە چوونەشی ئەوەیە ، کە ( ی ــ Y )و ( و ــ W )ی کۆنسۆنانت بە بزوێن تێگەیشــتووە . ( بڕوانــە ل ٣٢ی ئــەم کتێبە ، کە دەربارەی نیمچە بزوێنەکانی زمانی کوردییە ) . لێرەدا ئەوە دێنمەوە یاد ، کە لە زمانی کوردیدا دوو یاخود پتر دەنگی بزوێن لە پاڵ یەکدا ناتوانن بن . لەبەر ئەوە زۆر جار لە نێوان دوو دەنگی بزوێندا نیمچــە بزوێنێك ( ی ــ Y ) ، ( و ــ W ) پەیدا دەبێ ، یاخود بزوێنێکیان تێدەچێ .

هەروەها لە لاپەڕە (٤٠ ــ ٤١)دا مامۆستا هەورامانێ ژمارەیەك بزوێنی دۆلانە و سێلانە ..... ی هێناوەتەوە ، وەك : (آوە ، آوا ، آوای ، ایە ، وێ ، وێــە ، ەو ، یا ، یوە ...... ) کە بەشـــی هەرە زۆریان بزوێنی تێکەڵ بوو نین .

( وا ، وه ، هو ، یـا ....... ) بـه بزوێنی دۆلانــه دانــاوه ، کــه به هیچ جۆرێك لەگەڵ مەفهوم و مەرجی ناساندنەکە ڕێك ناکەون . بەلای‌منەوە له زمانی کوردیدا ، دەتوانرێ سێ بزوێنی دۆلانە دەست نیشان بکرێن :

١ ــ وێ . وەك :

توێژ ، نوێن ، گوێز ، نوێ ، گوێ ، نوێژ ......

٢ ــ وی . وەك :

هەنگوین ......

ئەو دۆ بزوێنە دۆلانەیە ــ واتە ( وێ ، وی ) تەنیا لە ناوچەی سلێمانێ و موکریان[٣٥] و هەندێ شوێنی دیکەی کوردستان باون . دەنا لە زوربەی دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانی کوردیدا بە جۆرێکی دیکە خۆیان دەنوێنن . واتە ــ ( هــەر دۆ دەنگی « و ، ێ ــ و ، ی» بێ تێکــەڵ بۆن تلفظ دەکرێن ، هەر وەك « د ، ێ ــ د ، ی » وەیــا هەر کۆنسۆنانتێکی‌تر بێت لە جیاتێ «د» بێ تێکەڵ بــۆن لەگەڵ « ێ ، ی »دا تلفظ دەکرێت ) .

٣ ــ وی . وەك :

دویر ، سویر ، کویر ، موی ......

ئەم دەنگــه بزوێنە دۆلانەیە لە بەشــێکی زۆری دیالێــکتی کرمانجێ ژۆرۆدا بــاوه ....[٣٦] . هەرچەندە لــه ئەلفوبێــی عەرەبیــدا لەگــەڵ

(٣٥) کەریمی ئەیـوبێ و ئی. ئا. سمیرنۆڤا لە ( کتێبی « دیالێــکتی کوردی موکرێ » ، لینینگراد ، ١٩٦٨ ، ل ١٣ )دا ، پەنجەیان بۆ ئەوە ڕاکێشاوە کە ئەو بزوێنی دۆلانەیە ( وی ، وێ ) لە بەشە دیالێکتی موکریدا هەن . بەڵام ئەوەی جێی ڕەخنــه بێ ، ئەوەیە کە ( وا )شــیان هەر بە بزوێنی دۆلانە داوەتە قەڵەم .

(٣٦) جێی سەرسوڕمانە کە لە نۆسینەکانی کوردناسانی سۆڤێتدا ، بە هیچ چەشنێك باسی ئەو بزوێنە دۆلانەیە نەکراوە .

( وی )ی  کرمانجی خـــوارۆدا وەك یـــەك دەنوسـرێن ، بـــەلاّم شێوەی تلفظیان جودایە ، واتە وەها ناخوێندرێنەوە وەك ڕواڵەتی نوسینیان نیشانی دەدات .

## دەنگە کۆنسۆنانتەکـان

( الحروف الصحيحة ـ Consonants )

کۆنسۆنانت بـــەو دەنگانە دەوتـــرێن ، کە لە دەربڕینیانـــدا هەندێ لە ئەندامانی نـــاو دەم لێك نزیك دەکەونەوە و دەبنە بەرهەڵســـت بۆ ئەو لوزەوی هەوایەی لە سیەکانەوە دێ . لـــە ئەنجامدا لە دەربازێکەوە دێنــە دەرێ[٣٧] .

دەنگە کۆنسۆنانتەکانی زمانی کوردیٖ :

( ب ، پ ، د ، ، ت ، گ ، ك ، ق ، ج ، چ ، ڤ ، ف ، ز ، س ، ژ ، ش ، غ ، ح ، ه ، خ ، ع ، و ـ w ، ی ـ y ، م ، ن ، ل ، ڵ ، ر ، ڕ )  بە تێکڕایی دابەش دەبن بەسەر ئەمانەدا :

**١ ـ ئاوازەدار** ( Voiced )

( ب ، د ، گ ، ج ، ڤ ، ز ، ژ ، ع ، غ ، م ، ن ، ل ، ڵ ، ر ، ڕ ، ، و ـ w ، ی ـ y )[٣٨] .

---

(٣٧) یاخود وەك د. پاکیزە ڕەفیق حیلمی دەڵێ : کۆنسـۆنانت ئەو دەنگەیە ، کە لە گەرۆدا گیر دەبێ و لـــە دەربازێکەوە دەردەبڕدرێت . ( بڕوانە : وتاری بۆژاندنەوەی زمان ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی سێیەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ١٦٠ ) .

(٣٨) دەمێکە کـــە هەندێ لـــە کوردناســـان ، وەك : ق. کوردۆ ، چ. بەکۆ ، د. مەکەنزیٖ ؛ وە لەم ساڵانەی دواییدا کەریم ئەیوبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا لە دەنگی کپ و ئـــاوەزەدار دواون . هـــەروەها شـــایانی باســـە کە لای

=

## ٢ ـ كپ ( Breathed )

(پ ، ت ، ك ، ق ، چ ، ف ، س ، ش ، خ ، ح ، هـ ) ٠

له زمانی کوردیدا بەرانبەر گەلێك دەنگی ئاوازەدار ، دەنگی کپ هەیه ، وەك له خوارەوه نیشانیان دەدەین ٠

| ئاوازەدار | کپ |
| --- | --- |
| ب | پ |
| د | ت |
| گ | ك |
| ٠ | ق |
| ج | چ |
| ڤ | ف |
| ز | س |
| ژ | ش |
| ع | ٠ |
| غ | خ |
| ٠ | ح |
| ٠ | هـ |
| م | ٠ |
| ن | ٠ |

═ خۆمانیش مامۆستا نوری عەلی ئەمین بۆ یەکەم جار له ساڵی ١٩٦٦دا له کتێبی « ڕابەرێ بۆ ئیملای کوردێ »دا لەو مەسەلەیەی کۆڵیوەتەوه ، بەڵام بەداخەوه تێکڕای دەنگه ئاوازەدار و کپەکانی لێك جیا نەکردۆتەوه . بەڵکو تەنها چەند دەنگێکیانی دەست نیشان کردووه .

ل ‌ •
ڵ •
ر •
ڕ •
و ــ w •
ی ــ y •

دەنگە کۆنسۆنانتەکانی زمانی کوردیی لە شێوەی دەربڕیندا دابەش دەبن بەسەر ئەمانەدا :

١ ــ **گۆسپەك** ( Obstruent ) :

( أ ) تەوژمۆك ( Plosive ) • وەك : ( ب ، پ ، د ، ت ، گ ، ك ، ق ) •

(ب) لەرزۆك ( Affricate ) • وەك : ( ج ، چ ) •

٢ ــ **خشۆك** ( Fricative ) :

( أ ) گڤۆك ( Noisy ) • وەك : ( ڤ ، ف ، ز ، ژ ، س ، ش ، خ ، غ ، ح ، هـ ، ع ) •

(ب) کەم دەنگ ( Sonant ) • وەك : ( و ــ w ، ی ــ y ) •

٣ ــ **زرینگۆك** ( Resonant ) :

( أ ) یێقلۆك ( Nasal ) • وەك : ( م ، ن ) •

(ب) لەرۆك ( Vibrant ) • وەك : ( ر ، ڕ ، ل ، ڵ ) •

به شوێنی دەربڕینیشـــدا ـ واتە لە چۆنیەتیَ جوڵانـەوەی زمـان و بەشداریَ لێو و ئەوکدا ـ دەنگە کۆنسۆنانتەکانی زمانی کوردیَ دابـەش دەبن بەسەر ئەمانەدا :

## ١ ـ لێوەکیَ ( Labial )

وەك : ( ب ، پ ، و ـ w ، م ، ف ، ڤ ) •

ئەم دەنگانەش دوَ جۆرن :

( أ ) ئەو دەنگانەی کە بۆ دەربڕینیان هەردوَ لێو بەشداریَ دەکەن •

وەك : ( ب ، پ ، و ـ w ، م ) •

(ب) ئەو دەنگانەی کە بە هـاوبەشیَ دانەکـانی سـەرەوە و لێـوی خوارەوە تلفظ دەکرێن ، وەك : ( ف ، ڤ ) •

## ٢ ـ زوانەکیَ ( Lingual )

ئەو دەنگانەن کە زمان دەورێکی چالاك بۆ دەربڕینیان دەبینیَ • ئەم دەنگانەش بە گوێرەی چۆنیەتیَ جوڵانـەوەی زمان بەرەو پێشەوە ، دەبن بە سیَ بەشەوە :

( أ ) پێشەوە :

وەك : ( د ، ت ، ج ، چ ، ز ، ژ ، س ، ش ، ل ـ ڵ ، ن ـ ر ـ ڕ ) •

(ب) ناوەڕاست :

وەك : ( ی ــ y ) .

( ج ) پشتەوە :

وەك : ( گ ، ك ) .

۳ ــ ئەوکی [۳۹] ( Glottal )

وەك : ( ق ، خ ، غ ، هـ ، ح ، ع )[٤٠] .

ئەوەی لە بارەی دەنگە کۆنسۆنانتەکانی زمانی کوردییەوە لە سەرەوە خستــومانەتە ڕۆ دەتوانرێ بەو جۆرە لەو خشتەیەی ( لاپەڕە ٤٠ )دا نیشان بدرێ[٤١] .

---

(۳۹) هەمۆ بلباس بە ( گەروو ) و ( قوڕگ ) دەڵێن ( ئەوك ) .

(٤٠) مامۆستا طاهر صــادق لە لاپەڕە (١٤)ی کتێبی « ڕێنــوس . چۆنێتی نوسینی کوردی »دا ( کەرکوك ، ١٩٦٩ ) ئەم دەنگانەی جیــا کردۆتەوە . بەڵام هەندێ دەنگ ، وەك ( گ )ی لەگەڵ ئەم پۆلەدا داناوە ، کە سەر بە پۆلێکی ترە .

(٤١) لە ڕێكخستنی ئەم خشتــەیەدا جگە لە تەجروبە و زانینی خۆم ، هەروەها سوودم لە هەنــدێ نەخشەی دەنگەکانی زمانی ڕۆســی و هەروەها ئەو نەخشانەی مامۆستایان : ق. کوردۆ ، چ. بەکۆ ، د. ن. مەکەنزی ، کەریمی ئەیوبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا .... دایانناوە وەرگرتووە .

ئەوەی لــەم ڕووەوە جێگەی ســەرنج بێ ئەوەیــە کە ق. کوردۆ ، چ. بەکۆ ، ك. ئەیوبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا ....... ( ل ، ڵ )یان لەگەڵ ( و ــ ی ) ڕیز کردووە ، واتە بە کەم دەنگ داویانەتە قەڵــەم . وا بزانم ڕاست نییە ( ل ، ڵ ) کــەم دەنگ بن لــە حاڵەتێکــدا ( ر ، ڕ ) لــەرۆك بن . جگە لەوە ( هـ )یان بە دەنگی ئاوازەدار داناوە ، کە ئەمیش بە ڕای من هەڵەیە ، چونکە ( هـ ) نەك هەر ئاوازەدار نییە ، بەڵکو زۆر کپە .

ب ، پ ، ت ، ج ، چ ، ح ، خ ، د ، ر ، ڕ ، ز ، ژ ، س ، ش ، ع ، غ ، ف ، ڤ ، ق ، ك ، گ ، ل ، ڵ ، م ، ن ، (و – W) ، ھ ، (ی – y)

| شوێنی دەربڕین | | شێوەی دەربڕین | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | لێوەکی | | | | زوانەکی | | | | | | نەوکی | |
| | | هەردوو لێو | | لێو و دان | | پێشەوە | | ناوەڕاست | | پشتەوە | | | |
| | | ئاوازەدار | کپ | ئاوازەدار | کپ | ئاوازەدار | کپ | ئاوازەدار | کپ | ئاوازەدار | کپ | ئاوازەدار | کپ |
| کۆسپەك | تەوژمۆك | ب | پ | | | د | ت | | | گ | ك | | ق |
| کۆسپەك | لەرزۆك | | | | | ج | چ | | | | | | |
| خشۆك | گشۆك | | | ڤ | ف | ز ژ | س ش | | | | | ع غ | خ ح،ھ |
| خشۆك | کەم دەنگ | و – W | | | | | | ی – y | | | | | |
| زرینگۆك | بێقلۆك | م | | | | ن | | | | | | | |
| زرینگۆك | لەرزۆك | | | | | ل ، ڵ ر ، ڕ | | | | | | | |

لەبەر ڕۆشنایی ئەو باسەی سەرەوە و ئەو خشتەیەدا کە دەربارەی دەنگە کۆنسۆنانتەکان کردوومانە و نیشانمان داوە ، دەتوانین خاسیەت و ناونیشانی دەنگە کۆنسۆنانتەکانی زمانی کوردی بەو شێوەیەی خوارەوە دەست نیشان بکەین :

( ب )

ئەم دەنگە بە شوێنی دەربڕیندا (لێوەکی)یە و لە تلفظ کردنیدا هەردوو لێو هاوبەش دەبن و دەنگێکی ئاوازەدارە و لە شێوەی دەربڕینیشدا دەنگێکی ( تەوژمۆك )ە .

( پ )

ئەم دەنگە بە شوێنی دەربڕیندا ( لێوەکی )یە و لە تلفظ کردنیدا هەردوو لێو هاوبەش دەبن و دەنگێکی کپە و لە شێوەی دەربڕینیشدا دەنگێکی ( تەوژمۆك )ە[٤٢] .

( د )

ئەم دەنگە بە شوێنی دەربڕیندا ( زوانەکی )یە ، لە کاتی تلفظ کردنیدا زمان بەرەو پێشەوە دەچێت ، دەنگێکی ئاوازەدارە و لە شێوەی دەربڕینیشدا دەنگێکی (تەوژمۆك)ە .

( ت )

ئەم دەنگە بە شوێنی دەربڕیندا ( زوانەکی )یە ، لە کاتی تلفظ کردنیدا

---

(٤٢) بەمەدا دەردەکەوێ کە دەنگی ( ب ) و ( پ ) وەك یەکن و جیاوازی لە نیوانیاندا تەنها ئەوەیە کە (ب) دەنگێکی ئاوازەدارە ، بەڵام (پ) دەنگێکی کپە . هەروەها دەنگەکانی ( د ) ــ ( ت ) و ( گ ) ــ ( ك )ش خاوەنی هەمان جیاوازین .

زمان بەرەو پێشەوە دەچێت ، دەنگێکی کپە لە شێوەی دەربڕینیشدا دەنگێکی ( تەوژمۆك )ە •

( گ )

ئەم دەنگە بە شوێنی دەربڕیندا ( زوانەکی )یە ، لە کاتی تلفظ کردنیدا زمان بەرەو دواوەی مەلاشوو دەچێت ، دەنگێکی ئاوازەدارە و ، لە شێوەی دەربڕیندا دەنگێکی (تەوژمۆك)ە •

( ك )

ئەم دەنگە بە شوێنی دەربڕیندا ( زوانەکی )یە ، لە کاتی تلفظ کردنیدا زمان بەرەو دواوەی مەلاشوو دەچێت ، دەنگێکی کپە و لە شێوەی دەربڕیندا دەنگێکی ( تەوژمۆك )ە •

( ج )

ئەم دەنگە بە شوێنی دەربڕیندا ( زوانەکی )یە ، لە کاتی تلفظ کردنیدا زمان بەرەو مەلاشوو دەچێ ، دەنگێکی ئاوازەدارە و لە شێوەی دەربڕیندا دەنگێکی ( لەرزۆك )ە •

( چ )

ئەم دەنگە بە شوێنی دەربڕیندا ( زوانەکی )یە ، لە کاتی تلفظ کردنیدا زمان بەرەو مەلاشوو دەچێ ، دەنگێکی کپە و لە شێوەی دەربڕیندا دەنگێکی ( لەرزۆك )ە •

( ڤ )

ئەم دەنگە بە شوێنی دەربڕیندا ( لێوەکی )یە ، لە تلفظ کردنیدا لێو و

ددان بەشدار دەبن ، دەنگێکی ئاوازەدارە • لە شێوەی دەربڕیندا دەنگێکی ( گڤۆك )ە •

( ف )

ئەم دەنگە بە شوێنی دەربڕیندا ( لێوەکی )یە ، لە تلفظ کردنیدا لێو و ددان هاوبەش دەبن ، دەنگێکی کپە • لە شێوەی دەربڕیندا دەنگێکی ( گڤۆك )ە •

( ز )

ئەم دەنگە بە شوێنی دەربڕیندا ( زوانەکی )یە ، لە کاتی تلفظ کردنیدا زمان بەرەو پێشەوە دەچێت ، دەنگێکی ئاوازەدارە و لە شێوەی دەربڕیندا دەنگێکی ( گڤۆك )ە •

( س )

ئەم دەنگە بە شوێنی دەربڕیندا ( زوانەکی )یە ، لە کاتی تلفظ کردنیدا زمان بەرەو پێشەوە دەچێت ، دەنگێکی کپە و لە شێوەی دەربڕیندا دەنگێکی ( گڤۆك )ە •

( ژ )

ئەم دەنگە بە شوێنی دەربڕیندا ( زوانەکی )یە ، لە کاتی تلفظ کردنیدا زمان بەرەو پێشەوە دەچێت ، دەنگێکی ئاوازەدارە و لە شێوەی دەربڕیندا دەنگێکی ( گڤۆك )ە •

( ش )

ئەم دەنگە بە شوێنی دەربڕیندا ( زوانەکی )یە ، لە کاتی تلفظ کردنیدا

زمان بەرەو پێشەوە دەچێت ، دەنگێکی کپە و لە شێوەی دەربڕیندا دەنگێکی ( گڤۆک )ە •

( م )

ئەم دەنگە بە شوێنی دەربڕیندا ( لێوەکی )یە ، لە تلفظ کردنیدا هەردوو لێو بەشدار دەبن ، دەنگێکی ئاوازەدارە و لە شێوەی دەربڕیندا (بیڤلۆک)ە •

( ن )

ئەم دەنگە بە شوێنی دەربڕیندا ( زوانەکی )یە ، لە تلفظ کردنیدا زمان بەرەو پێشــەوە دەچێــت و بە پۆکی ســەرووەوە دەتوسێ ، دەنــگێکی ئاوازەدارە و لە شێوەی دەربڕیندا ( بیڤلۆک )ە •

( ل ) ، ( ڵ )

ئەم دەنگانە بە شوێنی دەربڕیندا ( زوانەکی )ن ، لە کاتی تلفظ کردنیاندا زمان بەرەو پێشەوە دەچێت و بە پۆکی سەرووەوە دەتوسێت ، دەنگێکــی ئاوازەدارن و لە شێوەی دەربڕیندا ( لەرۆک )ن •

( ر ) ، ( ڕ )

ئەم دەنگانە بە شوێنی دەربڕیندا ( زوانەکی )ن ، لە تلفظ کردنیاندا زمان بەرەو پێشــەوە دەچــێ ، دەنگی ئــاوازەدارن و لە شــێوەی دەربڕینــدا ( لەرۆک )ن •

( ق )

ئەم دەنگە بە شوێنی دەربڕینــدا ( ئەوکی )یە ، لە پەیدابونیدا زمانە بچکۆلە دەورێکی گرنگ دەبینێ ، دەنگێکی کپە و لە شێوەی دەربڕیندا ( تەوژمۆک )ە •

( هـ )

ئەم دەنگە بە شوێنی دەربڕیندا ( ئەوکێ )یە ، لە بەشی خوارۆی ئەوکدا پەیدا دەبێ ، دەنگێکی کپە • لە شێوەی دەربڕیندا دەنگێکی ( گڤۆك )ە •

( ح )

ئەم دەنگە بە شوێنی دەربڕیندا ( ئەوکێ )یە ، لە بەشی سەرۆی ئەوکدا پەیدا دەبێ ، دەنگێکی کپە • لە شێوەی دەربڕیندا دەنگێکی ( گڤۆك )ە •

( خ )

ئەم دەنگە بە شوێنی دەربڕیندا ( ئەوکێ )یە ، زمانە بچکۆلە دەورێکی گرنگ لە پەیدا بۆنیـدا دەبینێ ، دەنگێکی کپە • لە شـێوەی دەربڕیندا دەنگێکی ( گڤۆك )ە •

( ع )

ئەم دەنگە بە شوێنی دەربڕیندا ( ئەوکێ )یە ، لە پەیدابۆنیدا زمانە بچکۆلە دەورێـکی گرنگ دەبینێ ، دەنگێکی ئاوازەدارە • لـە شێوەی دەربڕیندا دەنگێکی ( گڤۆك )ە •

( غ )

ئەم دەنگە بە شوێنی دەربڕیندا ( ئەوکێ )یە ، لە پەیدا بۆنیدا زمانە بچکۆلە دەورێکی گرنگ دەبینێ ، دەنگێکی ئـاوازەدارە و لە شـێوەی دەربڕیندا دەنگێکی ( گڤۆك )ە •

( و ـ W )

ئەم دەنگە بە شوێنی دەربڕیندا ( لێوەکێ )یە ، لە تلفظ کردنیدا هەردۆ

لێو کار دەکەن ، دەنگێکی ئاوازەدارە • وە لە شـێوەی دەربڕیندا ( کـەم دەنگ )ە •

( ی — ɛ )

ئەم دەنگە بە شوێنی دەربڕیندا ( زوانەکێ )یە ، لە تلفظ کردنیدا زمان لە ناوەڕاستی دەمدا دەبێ ، دەنگێکی ئاوازەدارە• وە لە شێوەی دەربڕیندا دەنگێکی ( کەم دەنگ )ە •

## خاسیەتی چەند ئەندامێکی ئاخاوتن لە کاتی دەربڕینی دەنگە کۆنسۆنانتەکاندا (٤٣)

لە تلفظ کـردنی دەنگە کۆنسـۆنانتەکاندا ، هەندێك لـە ئەندامانی ئاخاوتن شێوەی جیاواز وەردەگرن ، وەك :

١ ــ دەنگە ژێ ( الاوتار الصوتية Vocal Chords )

دەنگەژێکان لە سـەرێکەوە لەیەك نزیك دەبنـەوە و دەلەرێنەوە • لە سەرێکی دیکەوە دەکرێنەوە و لە باری ئاساییدا دەوەستن • لە حاڵەتـی یەکەمدا ، ئەو لەرینەوەیە ئاوازێکـی مۆسـیقایێ دەنـگ بەرز دروسـت دەکات • ئەو دەنگـانەی لەم رێگەیەوە دەردەبڕرێن بە دەنگی ئـاوازەدار ( المجهـور — Voiced ) ناودەبرێن ، وەك :

---

(٤٣) بۆ دەوری هەندێك لە ئەندامانی ئاخاوتن لە کاتی تلفظ کردنی دەنگە کۆنسۆنانتەکاندا بەتایبـەتێ سوودم لـە کتێبی : ( ئـا. ن. گڤۆزدێڤ ، زمانی ئەدەبێ ڕۆسێ ئەمڕۆ ، بەرگی یەکەم ، چاپی سێیەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ ، ل ١٧ــ٢٠ ) وەرگرتووە .

(ب ، د ، گ ، ج ، ڤ ، ز ، ژ ، ع ، غ ، م ن ، ل ـ ڵ ، ر ـ ڕ ، و ـ w ، ی ـ y ) •

له حاڵەتی دووەمدا دەنگەژێـــکان هاوبەشی تلفظ کردن نابن • ئەو دەنگانەی ، بێ هاوبـــەشیِ دەنگەژێـــکان دەردەبڕرێن ، بــه دەنگـــی کپ ( المهموس Breathed ) ناودەبرێن ، وەك :

**(پ ، ت ، ك ، ق ، چ ، ف ، س ، ش ، خ ، هـ ، ح ) •**

بەم جۆرە دەنگی ( ئاوازەدار ) و ( کپ ) دروست دەبێ •

**٢ ـ زمانە بچکۆلە •**

کاتێك زمانە بچکۆلە شۆڕ دەبێتەوە بۆ خوارەوە ، هەوا دەچێتە نـــاو بۆشایی لوت و ، کە زمـــانە بچکۆلە بەرەو پشـــت هەڵدەدرێتـــەوە ، ئەوە دەبێت بە لەمپەرێك بۆ هەوا چوون بۆ بۆشـــایی لوت • لــه حاڵەتی یەکەمدا بۆشایی لوت لە دەربڕینی دەنگی **( ن ، م )** دا هـــاوبەشی دەکـــات • ئەم دەنگانە بە دەنگی (بیڤلۆك) ناودەبرێن • بەلام لە حاڵەتی دووەمدا بۆشایی لوت لە دەربڕیندا هـــاوبەشی ناکـــات و ئەو دەنگـــانەش کە بەم شـــێوەیە دەردەبڕرێن ، تێکڕای دەنگە کۆنسۆنانتەکانی دیکـــەن ـ واتـــە جگـــە لە **( ن ، م )**

**٣ ـ لێو و ددان و زمان و مەلاشوو •**

لە تلفظ کردنی دەنگە کۆنسۆنانتەکاندا ، هەندێ جار زمان توند بـــە ددانەکانەوە **( ت ، د )** ، یاخود بە مەلاشووەوە **( ك ، گ )** دەنووسێ • هەندێ جاریش هەردوو لێو توند دەگوشرێن و لوزەوی هەوا کە دەیەوێ بۆ دەرەوە دەربچێت ، بە تەوژم بەو ئەندامـــانەدا تێدەپـــەڕێ و لەوەوە کوتوپڕ دەنگێك پەیدا دەبێ کە تەقینەوە دێنێتەوە یاد ، وەك **( ب ، پ )** .

## ڕەسەنێ یا نارەسەنێ هەندێ دەنگی زمانی کوردێ

لە نێو ڕۆژئاکبیرانی کورد و شارەزایانی زمانی کوردیدا کێشە لەسـەر ئەوەیە کە ئاخۆ دەنگی( ع ، غ ، ح ، ق ، ص ) کە ئێستا لە زمانی کوردیدا هەن بە ڕەسەن کوردین یان نا ! ....

لەم ڕووەوە مامۆستا چ. بەکۆ تۆسیوێتی دەڵێ : « فۆنێمی ( ق ) نەك تەنیا لە بەشە دیالێکتی کوردەکانی سۆڤێتدا ، بەڵکو لە زمانی کوردەکانی هەندەرانیشدا هەیە . لەوە دەچێ لەگەڵ ئەو وشانەدا هاتبێ ، کە لە زمـانی عەرەبێ و تورکییەوە هاتونەتە ناو زمـانی کوردییەوە ، وەك : (ئەقـڵ .... قەبر .... قاپ .... قۆڵ .... هتد )»(٤٤) .

دەنگی ( ح ) لە بەشە دیالێکتەکـانی کوردی تورکمەنسـتان و ئازربایجاندا ، وەك فۆنێم نییە ، بەڵام لەو وشانەدا ، کە لە زمانی عەرەبییەوە وەرگیراون هەندێ جار لە جێگەی ( هـ ) دادەنرێ . لە بەشە دیـالێکتی کوردی ئەرمەنستان و زمانی ئەدەبێ کوردیدا دەنگی ( ح ) زۆر بەکـار دەهێنرێ . لێرەدا چۆن لەو وشانەدا کە لە عەرەبییەوە وەرگـیراون ( بـە شێوەیەکی سەرەکێ) ، هەروەها لە وشەی کوردێ ڕەسەنیشدا زۆرە .

نەبۆنی ( ح ) وەك فۆنێم لە بەشە دیالێکتەکانی کوردی تورکمەنستان و ئازربایجان و خۆراساندا و ، نەگونجانی لەگەڵ زمانە ئێرانییەکان ، ئـەوە دەردەخەن کە لە زمانی عەرەبییەوە وەرگیرابێ(٤٥) .

بەڵگەیەکی دیکە بۆ نیشاندانی ئەوەی کە کۆنسۆنانتی ( ح ) لە زمانی عەرەبییەوە وەرگیرابێ ، ئەوەیە لە بەشە دیالێکتی کوردی ئەرمەنستاندا لـە

---

(٤٤) چ. خ. باکایێف ، زمـانی کوردەکانی سـۆڤێت ، مۆسـکۆ ، ١٩٧٣ ، ل ٤٧ــ٤٨ .

(٤٥) هەمان سەرچاوە ، ل ٥٠ .

زۆر وشەدا ( چ لە زمانی بێگانەوە وەرگیرابن ، یاخود بەڕەسەن کوردیی بن) دەنگی ( ح ) و ( هـ ) تێکەڵ دەکرێن ، واتە ــ هەر لە یەك وشەدا هەندێــك ( ح ) و هەندێکی دیکە ( هـ ) تلفظ دەکەن ، بە وێنە : حەبس = هەبس ، حەسرەت = هەسرەت ، حەساب = هەساب ، حەنــار = هەنــار ۰۰۰۰۰۰ ئەم دیاردەیە هەندێ جار لە زمانی ئەدەبیشدا خۆی دەنوێنێ ۰۰۰۰۰ ئەگەر ( ح ) دەنگێکی ڕەسەنی کوردیی یاخود ئێرانیی بوایە ، ئەوە نەدەبوو بــەو جۆرە لەگەڵ ( هـ )دا تێکەڵ بکرانایە[٤٦] ۰

لەو بارەیەوە مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانیی دەڵێ : « ئەتوانین بڵێین هەندێ دەنگی بێگانە کە قــەرز کراون سەرانســەری زارە کوردییەکانیان گرتۆتەوە ، وەك دەنگەکانی : ( ع ، غ ، ح ، ص ، ق ۰۰۰۰ ) ۰ من بەش بە حاڵی خۆم لەسەر ئەو بڕوایە نیم کە دەنگی ( ص ، ق ) بێگانــە و قەرز کراوبن ، چونکە دەنگی ( ص ) ، جگە لەو وشانەی کە لە بنەڕەتدا عارەبین وشەی زۆر هەن کە دەنگی ( ص )یان تێدا بێ ۰ ئەمە جگــە لەوەی کە لە ئاوێستادا (ترانسلێرەیشنی ئینگلیزیی) پتر لە سێ دەنگی ( س )ی تێدایە ، بەڵام لەبەر ئەوەی کە وێنــەی دەنگی( ص ) لــە ئینگلیزیی و لاتینیدا نییە ، ناتوانین بڵێین ئەمەیان( ص )ە و ئەوەیان (س)ە ، مەگەر بە سەلیقە ۰ خۆ دەنگی ( ق ) ، هەر ئێجگــار زۆرە و بەبێ جیاوازیی زارە کوردییەکان پــاراون لێی » [٤٧] ۰

---

(٤٦) هەمان سەرچاوە ، ل ٥١ .

(٤٧) محەمەد ئەمین هەورامانیی ، تەماشا کردنێکی سەرپێیی زاری سۆرانیی و زاری هەورامیی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیــاری کورد » ، بــەرگی دووەم ، بەشی دووەم ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ١٤٥ــ١٥٥ . ( مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانیی هەمان ڕای لە لاپەڕە ٨ــ٩ و ٤٤ــ٤٥ی کتێبی فۆنەتیکی زمانی کوردیی )دا دەربڕیوە » .

دەربارەی ئەم باسە مامۆستا نوریِ عەلی ئەمین نوسیویەتی : « ٠٠٠٠ هەندێ لەو باوەڕەدان کە پیتی ( ح ، ڤ ) لە کوردیدا نیبە ، بەلاّم هێشتا پێویستی بە لێکۆلّینەوەیە »[٤٨] .

هێنانەوەی ئەو چەند نمونە کەمەی سەرەوە ، ئەوە نیشان دەدەن کە دەربارەی دەنگی ( ع ، غ ، ح ، ق ، ص ) ڕای جیاواز هەیە ٠٠٠٠ هەرچەندە هەندێ بەلگە هەن ، سەرنج بۆ ئەوە ڕابکێشن کە ئەمانە بە ڕەسەن کوردیِ نەبن ، بەلاّم لە سەرێکی ترەوە بەلگەی ئەوتۆش هەیە ببێتە هۆی ئەوەی بە پێچەوانەوە بیر بکەینەوە ٠٠٠٠٠٠ ئەوەی ڕاستی بێ ئەوەیە ، لایەنگیرانی هیچ لایەکیان هێندە بەلگەی واقیعی و زانستییان بە دەستەوە نیبە بتوانن ڕای خۆیانی پێ سەربخەن و بچەسپێنن ٠٠٠٠٠٠ ئەم باسەش یەکێکە لەو کێشە سەخت و دژوارانەی زمانی کوردیِ ، کە تا ئێستا بە شێوەیەکی زانستیِ لێیان نەکۆلراوەتەوە و ڕۆن نەکراونەتەوە • بێ گومان ئەم کارە بەر لە هەمو شتێك بە لێکۆلّینەوە لە مێژوی زمانی کوردیِ ساز دەبێ [٤٩] • ڕەسەنیِ و نارەسەنیِ دەنگەکانی ( ع ، غ ، ح ، ق ، ص )

---

(٤٨) نوریِ عەلی ئەمین ، ڕابەریِ بۆ ئیملای کوردیِ ، بەغدا ، ١٩٦٦ .

به ڕاستیِ ڕای مامۆستا نوریِ زۆر جوانە و پەسەندی دەکەم کە دەلّێ : « ....... هێشتا پێویستی بە لێکۆلّینەوەیە » .... بەلاّم بەداخەوە ، لێرەدا ( هەرچەندە پەیوەندیِ بەم باسەوە نیبە ) مامۆستا کە نوسیوێتی : « هەندێ لەو باوەڕەدان کە پیتی ( ح ، ق ) لە کوردیدا نیبە .... » مەفهومی پیت و دەنگی تێکەلّ کردووە .... چونکە ئەوەی شکی لێ بکریِ بون و نەبونی دەنگی ( ح ، ق )ە ، نەك پیت دەنا گومان لەوەدا نیبە کە پیتی ( ح ، ق ) لە ئەلفوبێی عەرەبییەوە وەرگیراوە .

(٤٩) بۆیە لەم ڕووەوە ڕای خۆمم نەداوە ، چونکە لەم بارەیەوە خۆم لێکۆلّینەوەی تایبەتیم نیبە و لێکۆلّینەوەی سەلمێنەری خەلّکیشم نەبینیوە . جا بێ بەلگەی زانستیِ تەواو کێشەیەکی وا گرنگم پێ ساز نابێ ، وە بە گوترە و ڕەملّ نامەوێ ڕا دەربڕم .

بــه گەڕانــەوە بــۆ نــوسراوەکانی کــۆنی ئــاوێستا و پێــش ئاوێســتا ئاشکرا دەکرێ • بڕیاردان لەسەر ئەم ڕەســەنێ و ناڕەســەنییە بەوە نابێ کە سەرنج لە ڕواڵەتی ئاخاوتنی ئێستا بدرێت • لێرەدا ســەرنج بــۆ شتێك ڕادەکێشم : لــەو نوسینانەی کە لــە گردی ( شمشارە )ی نزیــك ڕانیە دۆزراونەتەوە ناوی ( حێش حینە ، قەبــرە •••••• ) هەیە • بە پێی ئەو وتارانەی کە باسی دۆزینەوەکان دەکات[٥٠] ناوچەکە ناوچەیێکی ( خورێ ) بووە • جا ئەگەر ساغ‌ببێتەوە کە ئەم وشانە ناوی ( خۆرێ )ن و خوریش بە کورد دەربچن ، دەردەکەوێ لــەو دەمانەدا ( ١٧٠٠ پ• ز• ) دەنگی ( ح ، ق ) لە کوردیدا هەبوە[٥١] •

---

(٥٠) بڕوانە :

١ ــ Prof. Dr. J. Laessoe, The Second Shemshara Archive -

مجلة «سومر» ، المجلد السادس عشر ، بغداد ، ١٩٦٠ ، ص ١٢ــ١٩ .

ب ــ

Prof. Dr. J. Laessoe, An Old - Babylonian Archive Discovered Tell Shemshara.

مجلة « سومر » ، المجلد الثالث عشر ، بغداد ، ١٩٥٧ ، ص ٢١٦ ــ ٢١٨ .

(٥١) ئەو بەڵگە مێژوییانە لە گەلێ ڕوی تریشەوە بایەخیان هەیە ، وە بەڕاستی د. کەمال مەزهەر ئەحمەد باشی بۆ چووە کە دەڵێ : « پەردە لادان لە ڕوی زۆر لە نمونەکانی ئەم جۆرە نوسراوانە و شیکردنەوەی ناوەرۆکەکانیان و بەراوردکردنێکی زانستیانە لە نێوان ئەم تەرزە پشکنینانە و هەر شتێکی پێوەندی بەمانەوە بێ یارمەتی ئەوە دەدا کە ڕوناکییەکی پتر باوێتە سەر ڕابوردوی کورد و وڵاتەکەیــان » ( بڕوانە : د. کمال مظهر احمد ، حول مشاكل دراسة تاريخ الشعب الكردي و مهمات المجمع العلمي الكردي ، « مجلة المجمع العلمي الكردي » ، المجلد الثاني ، العدد الثاني ، بغداد ، ١٩٧٤ ، ص ٢٩٣ ) .

# ئەندامەکانی ئاخاوتن

دەنگەکانی ئاخاوتن لە ڕێگای ئەندامەکانی ئاخاوتنی مرۆڤەوە دروست دەبن •

ئەندامەکانی ئاخاوتن لە پێنج بەشی سەرەکی پێکهاتوون :

١ ــ ڕشتەی هەناسە ( الجهاز التنفسي ) •

٢ ــ ئەوك ( الحنجرة ) •

٣ ــ مەلاشوو •

٤ ــ ئەندامەکانی تلفظ کردن •

٥ ــ ڕشتەی دەمارە ناوەندییەکان ( الجهاز العصبي المركزي ) •

ڕشتەی هەناسە لە : قەفەزی سنگ ( قفص الصدر ) ، ناوپنچك ( الحجاب الحاجز ) ، بۆریچە ( الشعبة ) ، بۆڕیی هەوا ( القصبة الهوائية ) پێکهاتووە • هەوا لە سییەکانەوە بە بۆڕیی هەوادا بۆ ئەوك دەچێت • ئەوك لە چەند کڕکڕاگە ( الغضروف )ێکی بزۆز ( المتحرك ) پێکهاتووە ، کە بە ماسولکە پێکەوە بەستراون ، یەکێك لە کڕکڕاگەکان بەرەو پێش دەبزوێ و لە ڕووی پێشەوە مل دەردەپەڕێ • دەنگەژێکان بە کڕکڕاگەکانەوە بەستراون ــ واتە دوو دەستە ماسولکەی بچووك • دەنگەژێکان بە پانایی ئەوك بە شێوەیەکی ئاسۆیی کشاون • لە نێوان ژێکاندا بۆریی هەوا هەیە •

مەلاشوو لە بۆشایی دەم و لەبۆشایی لووت پێکهاتووە • بۆشایی دەم لە

---

(٥٢) سەرچاوەی زانیاری باسی ئەندامەکانی ئاخاوتن کتێبی : ( ئا. م. زیمسکی ، س. ی. کریوچکوف ، م. ف. سفیتلایێف ، زمانی ڕووسی ، بەرگی یەکەم ، چاپی حەوتەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل ٦٣ ــ ٦٥) .

کاتی تلفظ کردنی دەنگەکاندا بارست و شێوەی دەگۆڕرێت • بەشێك لە دەنگەکانی زمانی کوردیێ بە دەم کردنەوەیەکی فراوان دەردەبڕرێن ، وەك : (ا) . بەشێکی دیکەیان دەمکردنەوەیەکی مام ناوەندیێ وەك : (یێ ، ۆ ، ە) . بەشی سێیەمیش دەمکردنەوەیەکی کەم ، وەك : (ی ، ــ و ، وێ) و دەنگە کۆنسۆنانتەکان • بۆشایێ لوت تەنیا لە دەربڕینی دەنگی( ن ، م )دا هاوبەشیێ دەکا • لە دەربڕینی تێکڕای دەنگەکانی دیکەی زمانی کوردیدا[٥٣] زمانە بچکۆلە دەبێت بە لەمپەرێك و نایەڵێ هەوا بڕوا بۆ بۆشایێ لوت •

ئەندامەکانی تلفظ کردن بە تایبەتیێ بریتین لە زمان و دەم • لە جوڵانەوەیاندا چالاکانە هاوبەشیێ دەربڕینی دەنگ دەکەن • بە وێنە لە دەربڕینی دەنگی( ف )دا لێوی خوارەوە لە ددانەکانی سەرەوە نزیك دەبێتەوە ؛ لە دەربڕینی دەنگی ( س )دا سەری زمان لە ددانەکان نزیك دەبێتەوە •••••••[٥٤] •

---

(٥٣) جگە لە دەنگی (نگ) کە ئەمیش هاوبەشی لوتی تێدایە و ئەم دەنگە تایبەتیێ شێوەی سلێمانییە .

(٥٤) لە تێکڕای ئەو لێکۆڵینەوانەدا کە دەربارەی ئەندامەکانی ئاخاوتن کراون ، ئەوە نیشان دراوە کە بۆ تلفظ کردنی دەنگەکانی ئاخاوتن هەوا لە سییەکانەوە بە بۆریێ هەوادا بۆ ئەوك و .......... دەچێت . بەلام من بەرچاوم نەکەوتووە باسی پێویستی و کەم و زۆریێ هەوا بۆ هەر دەنگێك بکرێ . یاخود نەم بینیوە ئەوە ڕەچاو بکرێ ، کە چۆن بۆ دەربڕینی هەندێ دەنگ لۆزەوی هەوا لە قوڵاییەوە دێت ، چۆن هەوای ناو ئەوك و دەم بۆ دەربڕینی هەندێ دەنگ بەش دەکات ؛ چۆن حاڵەتی وا هەیە کە بۆ دەربڕینی دەنگێك هەوا لە دەرەوە وەردەگیرێ .......

بۆ نمونە ، ئەگەر سەرنج لە دەربڕینی دەنگی ( هـ ) بگرین ، هەست دەکەین هەوا لە قوڵاییەوە دێت . بەلام بۆ دەربڕینی (ع) هەوای ئەوك ، بۆ (ب) هەوای ناو دەم بەش دەکات و پێویست بەوە ناکات لە قوڵاییەوە هەوایان بۆ هەڵکێشرێ . یاخود زۆر جار کە مرۆڤێکی لاڵ (ق) تلفظ =

کاری ئەندامەکانی ئاخاوتن ، پەیوەندیی تەواو و ڕاستەوخۆی لەگەڵ ( مێشك ) ــ ( ڕشتەی دەمــارە ئاوەندییەکان )دا هەیە و ئەمیش ڕابەر و سەرکاری هەمتویانە .

## چەند خاسیەتێکی فۆنەتیکی زمانی کوردی

١ ــ کورت کردنەوە ــ ئەگەر دوو دەنگی کۆنسۆنانتی وێکچوو یاخود لێك نزیك ، بکەونە پاڵ یەك ، ئەوە لە دەربڕیندا یەکێکیان ون دەبێ ، وەك :

کورتر = کورت + تر

بڵنتر = بڵند + تر

پاکردن = پاك + کردن[55]

دەسکەوت = دەست + کەوت[56]

٢ ــ لە زمانی کوردیدا دوو یاخود پتر دەنگی بزوێن لە پاڵ یەکدا ناتوانن بێن . لەبەر ئەوە زۆر جار لە نێوان دوو دەنــگی بزوێندا نیمچە بزوێنێك ( ی ــ y ، و ــ w ) پەیدا دەبێ ، یاخود بزوێنێکیان تێ دەچێ . وەك :

---

=

دەکات ئاشکرا هەست دەکرێ هەوای لــە دەرەوە بــۆ وەردەگرێ .... بەداخەوە ، ئــەمانە و گــەلێك کێشــەی دیکەی لــەم بابەتە لــە باسی ئەندامەکانی ئاخاوتن و فۆنەتیکدا ڕەچاو نەکراون . ( شایانی سوپاسە ، کە مامۆستا مەســعوود محەمەد سەرنجی نوسەری بــۆ ئەم تێبینییانە ڕاکێشــاوە ) .

(٥٥) لێرەدا شێوەی تلفظی ئەو وشانەم نوسیوە ، ئەگینا لەو ڕایەدام کە لە نوسیندا پێویستە ئەو پەڕاندن و ونبوون و تێکەڵاوبوونە نەبێت .

(٥٦) لە سەرێکەوە دەربڕینی سێ دەنگی (س، ت، ك)ی کۆنســۆنانتی کپ پێکەوە خۆش و ئاسان نییە لە سەرێکی تریشەوە لە زمانی کوردیدا (ت) کە لە دوای (س)ەوە دێت ، زۆر جار قــوت دەدرێ . بە وێنە لە زۆر جێگە

=

**( أ ) پەیدا بوونی نیمچە بزوێن :**

بە وێنــە کاتێ ئـــامرازی کۆ ( ان ) دەخرێتەســـەر وشەیەك کە کۆتایێ بە بزوێنی ( ا ، ۆ ، ێ ، ی ) هاتبێ ، ئەو دەمە نیمچە بزوێنی ( ی ـ y ) پەیدا دەبێ . وە بە نیسبەت ئەو وشانەشەوە کە کۆتاییان بە ( ۆ ) دێت ، ئەوە ( و ـ w ) یاخود ( ی y ) یـــــارمەتێ دەدات ، وەك :

برا = برا + ی + ان = برایان

چەقۆ = چەقۆ + ی + ان = چەقۆیان

دێ = دێ + ی + ان = دێیان

ڕێوی = ڕێوی + ی + ان = ڕێوییان

هەروەها لە حاڵەتی لکاندنی ئەمرازی ( ەکە )ی ناساندنیشدا هەمان دیاردە بەدی دەکرێت ، وەك :

گرێیەکە ، زەوییەکە ...... هتد .

**(ب) تێچوونی بزوێن :**

بەتایبەتێ ( ە ) کە بزوێنێکی دیکەی دێتە پاڵ تێدەچێ ، بە وێنە : لە شێوەی کوردێ تورکمەنستاندا :

---

=

(دەست) دەبێتە (دەس) ، (مەبەست) دەکەنە (مەبەس) .......

بەڕاستێ تێچوونی دەنگی (ت) ڕوونکردنەوە و لێـکۆڵینەوەی تەواوی دەوێ ، چونـکە لـە زۆر جێگەدا بێ ڕەچـاوکردنی نیـزیکی و دووری نێوان دەنگەکان ئەم ( ت )ە دەقـرتێ ، وەك دەوترێ ( دەڕوا ) لە جیاتێ (دەڕوات) ، (قەڵا) لە بریتی (قەڵات) . وە یاخود کە لە شێوەکانی ئاخاوتنی سلێمانێ لە زۆر جێگەدا ( ت )ە کە کلۆر دەکرێت وەك کە دەڵێن « ئەمە .. ( و ) لە چی » لـە بریتێ « ئەمەت لـە چی » ، یاخود « ڕا .. ( و ) لێیە ؟ » لە جیاتی « ڕات لێیە ؟ » .

بێگومان تێچوونی ( ت ) لـە دوای ( س )ەوە لێکۆڵینەوەی تایبەتێ دەوێت .

براك = برا + ەك

خانيك = خانی + ەك[٥٧]

له شێوەی كوردیٍ توركمەنستاندا :

ئەرەبە مە = ئەرەبە ( عەرەبانە ) + ا + مە [٥٨]

له حاڵەتی كۆدا ـ واته له ( ان ) خستنه سەر وشەدا ، وەك :

بەڕان = بەڕە + ان

مێشان = مێشە + ان[٥٩]

كاتێ ئەمرازی ( ەكە )ی ناساندن دەخرێتە سەر وشەیەك ، وەك :

پەردەكە = پەردە + ەكە

پارەكە = پارە + ەكە

..... و گەلێكی تر[٦٠]

---

(٥٧) لەم بارەیەوە قەناتی كوردۆ له نامەی دوكتۆریٍ علومەكەیدا « بەراوركردنی ڕێزمانی كوردیٍ » ، هەندێ زانیاریٍ نیشان داوە .

(٥٨) چەركەزی بەكۆ لـە بەشی فۆنەتیكی كتێبی « بەشـە دیالێكتی كوردی توركمەنستان »دا ، كە ساڵی ١٩٦٢ له مۆسكۆ بلاوی كردۆتەوە ، لەم ڕووەوە چەند سەرنجێكی داوە .

(٥٩) له لاپەڕە (١٩)ی كتێبی « دیالێكتی كوردی موكریٍ »دا كه كەریمی ئەیوبێ و ئی. ئا. سـمیرنۆڤا سـاڵی ١٩٦٨ لـه لێنینگراد بلاویـان كردۆتەوە ، سەبارەت بەم گۆڕانە دواون و چەند نمونەیەكیان هێناوەتەوە .

(٦٠) بێ گومان ڕێكەوتی پەیدابونی نیمچە بزوێن یاخود تێچونی بزوێن زۆرە . جا ئەو چەنـد نمونە كەمەی لـە سـەرەوە هێناومانەتـەوە مشتێكن له خەروارێك .

### ٣ ـ تواندنەوە Assimilation (٦١)

( أ ) زۆر جـار ( ز ) لە بەردەم هەنـدێ دەنـگی کپدا ، وەك ( س ) تلفظ دەکرێت ، بە وێنە :

گەزین ــ گەست ، گەستی ....

پارێز ــ پاراستن ، پاراستی ....

(ب) گەلێك جـار ( ژ ) کە دەکەوێتە پێش هەندێ دەنگی کپەوە ، وەك ( ش ) تلفظ دەکرێت ، بە وێنە :

ڕژان ــ ڕشتی ، ڕشتن ....

کوژرا ــ کوشتن ، کوشتی ، کوشتبوی ....

نێژرا ــ ناشتن ، دەنێژێ ، ناشت ، ناشتی ....

هەژدە ــ هەشت ، هەشتا ......(٦٢)

---

(٦١) وەك لەسەرەوە باسـمان کرد ، لە زمانی کوردیدا دەنـگی کۆنسۆنانتی ئاوازەدار و کپ هەن . جا لە زۆر زماندا ، هەروەها لە زمانی کوردیدا ، ئەگەر لەدوای دەنگێکی ئـاوازەدارەوە دەنگێکی کپ بێت ، ئەوسا دەنگە کپەکە کار دەکاتـە سەر دەنگە ئاوازەدارەکەی بـەردەمی و وەکو خۆی دەیکاتە دەنگێکی کپ ــ واتە دەیهێنێتە ڕیزی ئەو پۆلە دەنگانەی کە خۆی یەکێکە لێیان . جا بە شێوەیەکی کەم و سـست ، ئەم ڕوداوە لە فۆنەتیکی زمانی کوردیدا دەبینرێ ، بەتایبەتی ئەگەر لە پاش دەنگی ( ز ) و ( ژ )ەوە دەنگی ( ت ) هەبێت .

(٦٢) نوری عەلی ئەمین لە لاپەڕە (١٤ــ١٥)ی کتێبی ناوبراودا لەم بارەیەوە هەندێ نمونـەی هێناوەتـەوە ، بـەڵام باسی هۆی ئـەو تواندنەوەیەی نەکـردووە . هەروەها کەریمـی ئەیوبی و ئی. ئا. سـمیرنۆڤا لە بەشی مۆرفۆلۆژی کتێبەکەیاندا « دیالێکتی کوردی موکری » ، پەنجەیان بۆ ئەو جۆرە گۆڕانانـە ڕاکێشاوە ، بەڵام بێ ئەوەی هۆی دەسـت نیشان بکەن .

هەرچەندە مامۆسـتا مەسعود محەمەد لە لاپـەڕە (٥٩٢)ی وتاری « فۆنەتیك چیمان بۆ بکا ؟ »دا ، باسی ئەوەی کردووە کە دەنگی (س ، ش) هەر لە پێش دەنـگی ( ت )ەوە دێن و ناکەونە پێش دەنـگی ( د )ەوە و =

(ج) هەندێ جار ( س ) کە دەکەوێتە پێش دەنگی ئاوازەدارەوە ، وەك ( ز ) تلفظ دەکرێت[٦٣] ، بە وێنە :

دەزگا[٦٤]

دەزبەر[٦٥]

---

=

هەندێ هۆی لەباری بۆ ئەم دیاردەیە دیوەتەوە ، بەلاّم بە ڕای من هۆی هەرە گەورەی ئەم ڕۆدانەی باس نەکـردووە ، ئەویش ئەوەیە ، دەنگی (س ، ش) کە کۆنسـۆنانتی کپن لەگەڵ دەنـگی ( ت )دا کە ئەمیش هەر کۆنسـۆنانتی کپە پتر دەگونجێن ، وەك لەگەڵ دەنگی ( د )دا کە کۆنسـۆنانتی ئاوازەدارە . هەروەها دەنگی (ز ، ژ)ش کە کۆنســۆنانتی ئاوازەدارن لەگەڵ ( د )دا ، کە ئەمیش هەر کۆنسـۆنانتی ئاوازەدارە پتر ڕێك دەکەوێ ، وەك لەگەڵ ( ت )دا کە کۆنسـۆنانتی کپە .

(٦٣) لە گەلێك زماندا ، هەروەها لە زمانی کوردیدا ، ئەگەر لە دوای دەنگێکی کپەوە دەنگێکی ئاوازەدار بێت ، ئەوسا دەنگە ئاوازەدارەکە کار دەکاتە سـەر دەنگە کپەکەی بەردەمی و وەکو خۆی دەیکاتە دەنگێکی کپ ــ واتە دەیهێنێتە ڕیـزی ئەو پۆلە دەنگانەی کە خۆی یەکێـکە لێیان . جا بە شێوەیەکی کـەم و سـست ئـەم ڕۆداوە لە فۆنەتیکی زمـانی کوردیدا دەبینرێ ، بەتایبەتی ئەگەر لە پاش دەنگی ( س )ەوە ، دەنگی (گ ، ب ..) هەبێت .

(٦٤) وشەی « دەزگا » لە « دەست + گا » پێکهاتووە . لە سـەرێکەوە دەنگی (ت) قۆت دراوە ، واتە ــ لەمـەدا بەر یاسـای کورتکردنەوە کەوتووە لە سـەرێکی دیکەوە ( گ ) کە کۆنسـۆنانتی ئاوازەدارە لەگەڵ دەنگی ( ز )دا کە ئەمیش هەر کۆنسـۆنانتی ئاوازەدارە پتر دەگونجێ ، وەك لەگەڵ (س)دا کە کۆنسـۆنانتی کپە . لەم ڕووەوە یاسـای تواندنەوە کاری کردوە .

(٦٥) لە هەندێ ناوچــە بە « دەستەبەرە » دەڵێن « دەزبەر » . لــە حاڵەتی یەکەمدا ( س ) کە کەوتۆتە پێش ( ت )ەوە هیچ گۆڕانێك نەبووە . بەلاّم لە حاڵەتی دووەمدا کە کورت کردنەوە ڕۆی داوە ــ واتە ( تە ) لابراوە ، ( س )ی کۆنســۆنانتی کـپ کەوتـۆتە بـەردەم ( ب )ی کۆنســۆنانتی ئاوازەدارەوە و یاسـای تواندنەوە کاری کردووە .

مزگەر(٦٦)

(د) دەنــــگی (ك ، گ) کــە دەکەونــە پــێش دەنــگی (ێ ، ی ، وێ ، وی)(٦٧) شێوەی دەربڕینیــان دەگــۆڕێت و تا ڕادەیەك لە تلفظی دەنگی (چ ، ج) نێزیك دەبنەوە ، وەك :

کێرد ، کێشە ، کێم ، گێلاس ، گێڕانەوە ، کیسە ، گیسك ، کوێ ، گوێ ، هەنگوین ••••••

(هـ) زۆر جـــار کــە (د) دەکەوێتە دوای (ن) ، وەك (گ) دەردەبڕێت (ئەمەش بە تایبەتی خاسیەتی شێوەی سلێمانییە) ، وەك :

توند ــ تونگ
مەند ــ مەنگ

٤ ــ دەنگە گۆڕکێ :

هەندێ جار دەنگێ جێگای دەنگێکی دیکە وەردەگرێ ، یاخود لەیەك نزیك دەبنەوە ، وەك :

---

(٦٦) وشـەی « مزگەر » لە « مس + گەر » پێکهاتووە . لە وشـەی « مس »دا دەنگی ( س ) کپ تلفظ دەکـرێت . کاتێ پاشگری « گەر »ی دەخرێتە سەر ، دەبێتە ئاوازەدار و وەك ( ز ) دەوترێت . ئەویش هۆی دەوربینینی یاسای تواندنەوەیە ــ واتە کاتێــك ( س )ی کۆنسـۆنانتی کپ دەکەوێتە پێش ( گ )ی کۆنسـۆنانتی ئاوازەدارەوە ، دەبێتە دەنگێکی ئاوازەدار .

(٦٧) د. پاکیزە ڕەفیق حیلمی ، لە بەشی دووەمی وتاری « لە کوێوە دەست بکەین بە دەستوور سازی ڕێزمانی کوردی » ، کە لە بەشی یەکەمی بەرگی دووەمی « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد »دا بلاوی کردۆتەوە ، لە لاپەڕە (٣٣٥ــ٣٣٦)دا دەربارەی ئەم تایبەتییە دواوە .

| | |
|---|---|
| هـ/ح | هەسپ = حەسپ |
| | هەردۆ = حەردۆ |
| خ/غ | باخ = باغ |
| | خەم = غەم |
| خ/هـ | خۆرد = هۆرد |
| ئ/هـ | ئاوەڵ = هاوەڵ |
| | ئەسپ = هەسپ |
| ێ/ا | مێ = ما |
| | کێرد = کارد |
| ا/ە | بادام = بادەم |
| | ئاژاڵ = ئاژەڵ |
| ب/پ | بچۆك = پچۆك |
| | خراب = خراپ |
| م/و | دامێن = داوێن |
| | نیم = نیو |
| هـ/ی | تەنها = تەنیا |
| | خواهیشت = خواییشت |
| ف/و | خەفت = خەوت |
| | حەفت = حەوت[٦٨] |

---

(٦٨) مامۆستا نوری عەلی ئەمین لە کتێبی « ڕابـەری بۆ ئیملای کوردی »دا ( بەغدا ، ١٩٦٦ ) ، باسی هەندێ لەو لێك نزیك بۆنەوانەی کردووە کە لە سەرەوە ناومان بردن .

ف/و ئاف = ئاو

ناوك = ناڤك

ح/ع حاجی = عاجی

حەمەد = عەمەد[٦٩]

م/ڤ دەم = دەڤ

م/و دەم = دەو[٧٠]

د/٠ مندالّ = منالّ

سوتاندن = سوتانن[٧١]

ز/ذ زارۆلە = ذارۆلە

زەلام = ذەلام

---

(٦٩) ماموّستا طاهر صادق لە لاپەرە (٣٦)ی ئەو کتێبەیدا کە سالّی ١٩٦٩ لە بارەی چۆنێتــی نوسینی کوردییەوە بلاوی کردوّتەوە ، دەربــارەی ئەم گۆڕانە دواوە .

(٧٠) هەندێ جار ، لە کۆتایی وشەدا دەنگی ( م ) لە دیالێکتی کرمانجی ژوروّدا دەبێ بە ( ڤ ) . وە لە دیالێکتی کرمانجی خواروّدا دەبێ بە ( و ) .

(٧١) هەندێ جار دەنگی ( د ) لە وشەدا ( بەتایبەتی لە شێوەی سلێمانێدا ) دەکەوێ . وە هەندێ جاریش دەبێ بــە ( ئــ ) . ئەگەر چی لە ئاخاوتنی ناوچەی سلێمانێدا ئەو فوتدان و گۆرانە هەیە ، بەلاّم لە زمانی ئەدەبی و نوسیندا پێویستە واز لەو جۆرە تایبەتیانە بهێنرێ . لە بریتی : « منالّ ، سوتانن ، ئەکەم ، ئەرۆم .... » ڕاســتتر وایە بنوســین : « مندالّ ، سوتاندن ، دەکەم ، دەرۆم .... » .

د. نەسرین فەخری لە وتاری « پاشگری ( اندن ) لە زمانی کوردیدا » ( گوّڤاری کوّری زانیاری کورد ، بەرگی سێیەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٢٠٧ــ٢٠٨ ) باســی فوتدانی دەنگی ( د )ی کــردووە . وە د. عیزەدین مســتەفا ڕەسولّ لە کتێبی « زمانی ئــەدەبی یەکگرتوی کوردی»دا ( ل ٦٠ ، پــەراوێز ١٧ ) دەربارەی گــوّرانی ( د ) بە ( ئــ ) دواوە .

س/ث — سەرما = ثەرما
سەر = ثەرە[72]

ب/و — دەربەست = دەروەست
دابەزە = داوەزە

ت/٠ — دەست = دەس
مەبەست = مەبەس

د/ی — بادەم = بایەم

هـ/٠ — هوشیار = وشیار
هورد = ورد

..... و گەلێکی تر .

٥ ــ سروشتی دەنگەکانی ئاخاوتنی کوردیی لە ڕوی گونجان و نەگونجانیانەوە لەگەڵ یەکتردا[73] و ، شوێنیان لە وشەدا .

---

(٧٢) لە شێوەی هەورامیدا ، زوربەی دەنگی ( ز ، س )ی سەرەتایی دەبن بە ( ذ ، ث ) . مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی لە وتاری « تەماشا کردنێکی سەرپێیی زاری سۆرانی و زاری هەورامی »دا ( گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، بەرگی دووەم ، بەشی دووەم ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ١٥٣ ) دەربارەی ئەو دیاردەیە دواوە .

(٧٣) دەربارەی هەندێ خاسیەتی گرنگ و سەرەکی فۆنەتیکی زمانی کوردیی ، لە وتاری « فۆنەتیك چیمان بۆ بکا ؟ »ی مامۆستا مەسعود محەمەددا ( گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، بەرگی سێیەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٥٦٨ــ٧٢٢ ) چاومان بە ژمارەیەك نمونەی ورد و زانستی دەکەوێ . نوسەر لەم وتارەدا بەگشتی لە تایبەتیەکانی فۆنەتیکی کوردیی دواوە و بەتایبەتی سەبارەت بە حەز لەیەکتر کردن و لەیەکتر دژ بونی دەنگەکانی ئاخاوتنی کوردیی کۆڵیوەتەوە ــ واتە لە سروشتی دەنگەکانی
=

( أ ) دوو دەنگی ( ل ، ڵ ) بە هیچ کلۆجێك هەڵناگرن بخرێنە پێش دەنگی ( ر ، ڕ )(٧٤)ەوە ، یاخود بە پێچەوانەشەوە کورد ( ر ) لە پێش ( ل )ەوە ناهێنێ(٧٥) .

(ب) لە زمانی کوردیدا دەنگی ( ر )(٧٦) و ( ڵ ) بە هیچ جۆرێك

---

=

ئاخاوتنی کوردی لە ڕووی گونجان و نەگونجانیانەوە لەگەڵ یەکتردا توێژیوەتەوە .... دوای باسێکی تەواوی کێشەی فۆنەتیکی زمانی کوردی ، ئنجا لە ئەنجامدا بۆ خزمایەتی و دژایەتی ناوخۆیی دەنگەکانی ئاخاوتنی کوردی چوار پلەی دەست نیشان کردووە ( گونجانی تەواو ، گونجان ، نەگونجان ، دژایەتی ) و نموونەی زۆر و ڕاست و لەباری هێناوەتەوە ..... بە ڕای من باسی ئەو تایبەتییانەی مامۆستا مەسعود لە ئەنجامی لێکدانەوەی تایبەتی خۆیدا هەستی پێیان کردووە و بۆیان چووە ، لە باسی فۆنەتیکی زمانی کوردیدا کارێکی نوێیە .

(٧٤) بڕوانە : هەمان سەرچاوە ، ل ٥٦٩ .

(٧٥) بڕوانە هەمان سەرچاوە ، ل ٦٠٧ .

(٧٦) مامۆستا چ. بەکۆ لە کتێبی « زمانی کوردەکانی سۆڤێت »دا ( مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ) پەنجەی بۆ ئەوە ڕاکێشاوە ، کە دەنگی ( ر ) لە سەرەتای وشەدا بەکار ناهێنرێ ( ل ٥٤) . وە دەربارەی خاسیەتی فۆنێمی ( ڕ ) نووسیویێتی دەڵێ : « کۆنسۆنانتی ( ڕ ) وەك فۆنێم لە زمانە ئێرانییەکانی تردا نییە . بە خاسیەت و شوێنی بەکار هێنانیدا بە تەواوی لەگەڵ فۆنێمی ( ڕ )ی زمانی ئەرمەنیدا وێك دەچن . هەروەها دەنگی ( ر )ی کوردی هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ( ر )ی زمانی ئەرمەنیدا نییە . ئەوەی پتر سەرنج ڕادەکێشێ ، ئەوەیە چۆن لە زمانی کوردیدا ، هەر بەو جۆرەش لە زمانی ئەرمەنیدا لە سەرەتای وشەدا تەنیا ( ڕ ) بەدی دەکرێ . جگە لە وشەی ( رۆنە = دەقیقە ) نەبێت کە لە زمانی ئەرمەنیدا تاکە وشەیە ( ر ) لە سەرەتادا هاتبێت ........ بێگومان ، ئەمە ئەوە نیشان نادات ، کە کورد دەنگی ( ڕ )یان لە ئەرمەن وەرگرتبێ ، هەر بەو جۆرەش ناکرێ بە پێچەوانەوە بیر بکرێتەوە . بەڵام وێکچوونیان سەرنج بۆ پەیوەندی زمانی لە نێو ئەو دوو زمانەدا ڕادەکێشێ ، بەتایبەتی ئەگەر هەندێ وێکچوونی دیکەش ، کە لە چەند دەنگێکی تردا هەن ڕەچاو بکرێن » (ل ٥٥) .

له سەرەتای وشەدا بەکار ناهێنرێن •
•••• هتد •

## کورتە بەراوردێك لە نێوان
## فۆنەتیکی دیالێکتی کرمانجی ژۆرو و خوارۆدا

هۆی هەندێك لەو گۆڕان و لێك نزیك بونەوانەی لە سەرەوە لێیان دواین ، تا ڕادەیەك بونی دیالێکت و بەشە دیالێکتی جیاوازە لە زمانی کوردیدا ••• لەم بەشەشدا لەو خاسیەتە تایبەتییانە دەدوێین کە پەیوەندییان بە دیالێکتی کرمانجی ژۆرو و خوارووەوە هەیە :

١ ــ لە کۆتایی هەندێ وشەدا ، لە کرمانجی ژۆرودا (ی) و ، لە کرمانجی خوارۆدا (ۆ) ، بەرامبەر یەك دەوەستن ، وەك :

| کرمانجی ژۆرو | کرمانجی خوارۆ |
|---|---|
| پاری | پارۆ |
| خانی | خانۆ |
| کولی | کولۆ |

٢ ــ هەروەها بە پێچەوانەوە ، هەندێ جار (ۆ) لە کرمانجی ژۆرودا ، بەرامبەر بە (ی) لە کرمانجی خوارۆدا ، ڕادەوەستێ ، وەك :

| کرمانجی ژۆرو | کرمانجی خوارۆ |
|---|---|
| تۆژ | تیژ |
| شۆر | شیر |

٣ ــ له گه‌لێ شوێندا ، لــه كرمانجی ژۆرۆدا ( ڤ ) به‌رامبه‌ر به ( و ــ w )ی كرمانجی خوارووه ، وه‌ك :

| كرمانجی ژۆرۆ | كرمانجی خوارۆ |
|---|---|
| چاڤ | چاو |
| شه‌ڤ | شه‌و |
| هاڤین | هاوین |
| سێڤ | سێو |
| هه‌ڤیر | هه‌ویر |

٤ ــ له زۆر وشه‌دا كه سه‌ر به هه‌ردۆ دیالێكتن ( ه ) لــه كرمانجــی ژۆرۆدا ، به‌رامبه‌ر به ( i ) له كرمانجی خوارۆدا ده‌بینرێ ، وه‌ك :

| كرمانجی ژۆرۆ | كرمانجی خوارۆ | |
|---|---|---|
| قه‌نج | قنج | qinc |
| چه‌نگ | چنگ | çing |
| كــه‌چ | كچ | kiç |

٥ ــ هه‌روه‌ها به پێچه‌وانه‌وه ، وا زۆ ده‌دات ( i ) له كرمــانجی ژۆرۆدا ، به‌رامبــه‌ر بــه ( ه ) لــه كرمــانجی خــوارۆدا ڕاده‌وه‌ســتێ ، وه‌ك :

| كرمانجی ژۆرۆ | | كرمانجی خوارۆ |
|---|---|---|
| هل | hil | هــه‌ڵ |
| هنه‌ك | hinek | هه‌ندێك |
| در | dir | ده‌ر |
| دكه‌ت | dikit | ده‌كات |

٦ ــ لــه هەنــدێ وشـەدا ( و ) له کرمانجی ژوروودا ، بەرامبــەر ( i ) دەوەستێ له کرمانجی خواروودا ، وەك :

| کرمانجی ژووروو | کرمانجی خواروو |
| --- | --- |
| کورم | کرم kirm |
| کور | گڕ gir |

٧ ــ ڕێدەکــەوێ که ( هـ ) له کرمـــانجی ژوروودا ، بەرامبــەر به ( و ــ w ) دەوەستێ له کرمـــانجی خواروودا ، وەك :

| کرمانجی ژووروو | کرمانجی خواروو |
| --- | --- |
| هشك | وشك |
| هشیار | وشیار |
| هرچ | ورچ |
| هور | ورد(٧٧) |

٨ ــ هەندێ جـــار ( س ، ت ) له کرمانجی خـــواروودا ، دەبـــێ به ( ص ، ط ) له کرمانجی ژووروودا ، وەك :

| کرمانجی ژووروو | کرمانجی خواروو |
| --- | --- |
| صار | سارد |
| صۆر | سوور |
| طەڤر | تەور |
| طاوه | تاوه |

---

(٧٧) قەناتی کـــوردۆ له نامەی دوکتۆریەکەیدا هەندێك لـــەو تایبەتیانەی فۆنەتیکی دیالێــکتی کرمانجی ژووروو و خوارووی نیشـــان داوه . بۆ ئەم بەراورد کردنە و هەندێ شـوێنی دیکەی ئەم نوسینەم سودێکی زۆرم له سەرچاوەی ناوبراو وەرگرتووه .

٩ ــ جێگۆڕکێ ــ له هەندێ وشەدا پاش و پێش خستنی دەنگ دەبینرێ ، وەك :

| کرمانجی ژۆرو | کرمانجی خوارو |
|---|---|
| بەرف | بەفر |
| تەزرە | تەرزە |
| جینار | جیران |
| خیز | زیخ(٧٨) ، (٧٩) |

# بڕگــه

( Syllable  المقطع )

ئەو هەوایەی لــه کاتی ئاخاوتندا له بۆشــایی دەمەوە دێتــه دەرێ ، به یەك جار دەرناچێ ، بەڵکو به چەند تەکانێك دەرباز دەبێ • هەوای تلفظ کردنی هەر وشەیەك به چەند تەکان له دەمەوە دێتە دەرێ ، ئەوە ئەو وشەیە بەسەر ئەوەندە بــەش یاخود بڕگەدا دابەش دەبێ • به وێــنە ، له وشەی « **سۆ ــ ران** »دا ــ دۆ بڕگە ؛ له وشەی « **گۆ ــ زە ــ لە** »دا سێ بڕگە ؛ له وشەی « **دۆ** »دا یەك بڕگە هەیە •••••

---

(٧٨) د. عیزەدین مســتەفا ڕەسوڵ ، لــەو وتارەیدا که بــۆ ( یەکەم کۆڕی لێکۆڵینەوەی کتێبی قوتابخانه به زمــانی کوردی ) نوسیوە ، هەندێك باسی ئەو پاش و پێش خستنەی کردووە . بڕوانه : گۆڤاری « پەروەردە و زانست » ، ژ ٦ ، ١٩٧٣ ، ل ٩٣ــ٩٤ .

(٧٩) ئەم جێگۆڕکێیە وەنــەبێ تەنیا هۆی بۆنی دیالێکت و بەشــه دیالێکتی جیاواز بێت ، بەڵکو زۆر جار ئەم دیاردەیە له یەك دیالێکتدا و هەروەها له تاکه کەسێکیشدا دەبینرێ . وەك :

چاوەڕوانی ــ چاوەنواڕی .

فڕین ــ ڕفین .

.........وەگەلێکی دیکه .

بڕگە ــ بریتییە لە دەنگێك یاخود پتر لە دەنگێك ، کە بە یەك تەکانی هەوای دەربازبۆ لە دەم تلفظ کرابێت •

ڕاستە بــڕگە لە دەنگێك یاخود چەند دەنگێك پێــك دێت • بەڵام پێویستە پەنجە بۆ ئەوە ڕابکێشین ، کە لە بڕگەدا دەنگی بزوێن هەیە و دەور دەبینێ • هەر لەبەر ئەوەشە کە ژمارەی بڕگەکانی هەر وشەیەك ، هێندەی ژمارەی بزوێنەکانی ئەو وشەیە دەبێت• بۆ نموونە ، لە وشەی « **گۆرانی** »دا سێ بزوێــن هەیە و ئــەمەش بــووە بە هۆی بــوونی سێ بــڕگە ، وەك « **گۆ ــ را ــ نی** » • هەروەها لە وشەی « **سەرتاش** »دا ــ دوو بـــــزوێن هەیە و ئەمەش بووە بە هۆی بوونی دوو بڕگە « **سەر ــ تاش** » ......(٨٠)

لە زمانی کوردیدا دوو جۆر بڕگە هەیە :

---

(٨٠) ڕەنگە تایبــەتی و سروشتی دەنــگەکانی زمانی کــوردی و گونجــان و نەگونجانیان لەگەڵ یەکتردا دەور دەبینن .... نموونەی ئەمەش لە وتاری ناوبراوی مامۆستا مەسعوود محەمەددا بەرچاو دەکەوێ . بە وێنە مامۆستا نوسیوێتــی :« ئەم دەنگــەی (ر) کە بە سکــون دەکەوێتە پێش دەنگی (د)یشـەوە هەر بەتەواوی دەوەستێندرێ و هیچ قورس کردن و ددانلێ گیرکردنێك قبوڵ ناکا . وشەکانی (مەرد ، مێرد ، گورد ، سارد ، بەرد ، کورد ، ورد ، گەرد ، وەرد .... هتاد) ئەوانیش هەمۆیان هەر لەبەر ئەم هۆیەیە یەك بڕگەن ، وشەی ( هەڵگورد ) کە بۆتە دوو بڕگە واتە ( هەڵ ــ گۆرد ) ئەگەر لەبەر ئەم تایبەتییە دەنگی ( ر ) نەبا دەبۆ بە سێ بڕگە واتە ( هەڵ ــ گۆ ــ رد ). بۆ ڕوون کردنەوە وشەی ( هەڵگۆرد ) هەر دوو جۆری بە پیتی لاتینی دەنوسم، لە جێگەی قورس کردنیش نیشانەی ( i ) دادەنێم ( هەڵگۆرد )ی دوو بــڕگەیی بە لاتینی وەها دەنوســرێ ( Hel - gord ) هی سێ بڕگەییش وەهای لێ دێ ( Hel - go - rid ) .......»

(بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، ل ٥٩١).

بەمەدا ئەوەمان بۆ ڕوون بۆوە کە وشەی (هەڵگۆرد) لە دوو بڕگە پێکهاتوە بەڵام ئەگەر ( i ) بخرێتە نیوان (ر) و (د)ەوە ئەوە وشەکە دەبێ بە سێ بڕگە ..... واتــە لێــرەدا ، ئەم ( i ) ە قورس کردن بێ ( وەك ڕای مامۆستا مەسعوود محەمەد ) یاخود پەیدابوونی بزوێنێکی دیکە بێ ( وەك ڕای نوسەری ئەم کتێبە ) ، ئەوە بڕگەیەکی تر زیاد دەکا . جا ئەگەر

=

۱ ــ بڕگەی کراوە ( Open syllable )

ئەو بڕگەیەیە ، کە بە دەنگێکی بزوێن کۆتایی هاتبێ •

وەك : ( دۆ ، شا ــ نە ، کا ، فیـ ــ کە ، پێ ، چە ــ تە ، دە ، تو ــ ڕە ••• ) •

۲ ــ بڕگەی داخراو ( Closed syllable )

بەو بڕگەیە دەترێ ، کە بە دەنگێکی کۆنسۆنانت کۆتایی هاتبێ •

وەك : ( پیر ، شیر ، بەر ــ ماڵ ، ســەر ، دار ، ســەر ــ دار ، بــۆر بــار ــ گیر ••• ) •

## هێــز

### ( Stress النبــرة )

لە کاتی ئاخاوتنــدا هەندێ بڕگە درێژتر و بەهێــزتر و توندتر تلفظ دەکرێن • بە وێنە لە وشەی (( **باران** ))دا ، بڕگەی دووەم (( **ران** )) درێژ تر و بەهێزتر و توندتر تلفظ دەکرێ ، وەك لە بڕگەی یەکەم ــ (( **بــا** )) .

توندتر تلفظ کردنی بڕگەیەك لە فۆنەتیکدا بە ( **هێــز** ) ناسراوە • بەو جۆرە بڕگانەش دەوترێ ( بڕگەی هێزدار ــ Stressed syllable )

زوربەی کوردناسانی سۆڤیێت لەو ڕایەدان ، کە هێز لە زمانی کوردیدا ،

---

=

بەتەواوی بچەسپێنرێ کە ئەوە قورس کردن بێ ، ئەوسا دەردەکەوێ کە قورس کردنیش دەتوانێ دەوری جیا کردنەوەی بڕگە ببینێ . بەڵام بێت و ئەنجام بە بزوێنی ساغ بکاتەوە ، بێگومان ، ئەوەش ئەو ڕایەمان پتەو دەکا کە وتۆمانە ژمارەی بڕگەکانی هەر وشەیەك هێندەی ژمارەی بزوێنەکانی ئەو وشەیە دەبێت .

به زۆریێ دەکەوێتە سەر دوا بڕگەی وشە[٨١] .

لە هەندێ حاڵەتـدا وا ڕوو دەدات ، هێـز لە یەك وشەدا شـوێنی لە بڕگەیەکەوە بۆ بڕگەیەکی دیکە دەگوێزرێتەوە بێ ئەوەی کار بکاتە سەر مانای وشەکە . بەڵام هەندێ جاریش لە گواستنەوەی هێزدا مانای جیاواز پەیدا دەبێ .

بە وێنە ، وشـەی « **سەوزە** » ، ئەگەر هێز لەسەر دوا دەنگی دابنرێ ، ئەوە ماناکەی « هەموو جۆرە شینایـیـەك دەگرێتەوە کە ڕوابێ » . خۆ ئەگەر هێز بخرێتە سەر دەنگی دووەمی ، ئەوسا بە مانای« **ڕەنگی سەوز** » دێت . وەك بوترێ : « **ئەو مەرەکەبە سەوزە ...** » . وشەی « **تەختە** » ئەگەر هێز لە سەر دوا دەنگی دابنرێ ، ئەوە ماناکەی ( **لوح** )ی عـەرەبێ دەگرێتەوە . خۆ ئەگەر هێز بخرێتە سەر دەنگی دووەمی ، ئەوسا بە مانای ( انه مستـوٍ أو عدل" )ی عـەرەبێ دێت ( بێ گومـان ، هـەردوو وشەی « **سەوزە** » و « **تەختـە** » لە حاڵەتی دووەمدا هەر بە ڕواڵەت وشەن ، دەنا هەردوویان ڕستەی تەواون . بەمەدا دەبێ ئەوە لە بیر نەکەین کە لە زمانی کوردیدا دەوری واتاگۆڕێ هێز لەگەڵ هەندێ زماندا دوور دەکـەوێتەوە . ئەو دوور کەوتنـەوەیەش ئەوەیە کە گواستنەوەی هێز لـە بڕگەیەکەوە بۆ بڕگەیەکی تر بە زۆریێ وشەکە دەکاتە ڕستە و هەمان وشە نامێنێت ) .

بەم جۆرە دەبینین، کە لێرەدا گواستنەوەی هێز دەبێتە هۆی پەیدابوونی

---

(٨١) بە وێنە بڕوانە :

(ا) قەناتی کوردۆ ، ڕێزمانی زمانی کوردیێ ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ ، ل ٢٣ .

(ب)چەرکەزی بەکۆ ، زمانی کوردەکانی ئازربایجان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٥ ، ل ٢٥ .

(ج)کەریم ئەیوبێ و ئی.ئا. سمـیرنۆڤا ، دیالێکتی کوردیێ موکریێ ، لێنینگراد ، ١٩٦٨ ، ل ١٧ .

......... هتد .

مانای جیاواز • بەڵام واش ڕۆ دەدات ، کە گواستنەوەی هێز کار ناکاتە سەر گۆڕینی مانـا • بە نمۆنە ، وشەی « پەردە » ــ ــ هەرچەنـد لە ڕەسەندا هێز بەسەر دوا دەنگەوەیە ، بەڵام ئەگەر لەسەر بزوێنی یەکەمین دابنرێ مانا هەر ناگۆڕێ • لە وشـەی « دارا »دا هێز لەسـەر بزوێنی یەکەم یاخود دووەم دابنرێ مانای وشەکە ناگۆڕێت ••••• هتد •

هەر زمانێکی سـەر ڕۆی ئەم زەمینە بگرین ، دەبینین کـە خاوەنی چەندین تایبەتێتی ئەوتۆیە ، کە لە زمانەکانی دیکەی جودا دەکاتەوە ، یاخود ڕۆی وای هەیە نزیکی دەخاتەوە • خۆ ئەگەر لە زمانی کوردیدا لە هێز ورد ببینەوە و لەگەڵ چەند زمانێکدا بەراوردی بکەین ، ئەوە هەندێ ڕاستیمان بۆ ئاشکرا دەبێ • بە وێنە هێز لە زمانی کوردیدا وەك هەر زمانێکی دیکەی سەرڕۆی ئەم زەمینە ، دەخرێتە سەر بزوێن[٨٢] ؛ دەکرێ لە بڕگەیەکەوە بۆ بڕگەیەکی تر بگوێزرێتەوە و ؛ دەتوانرێ دەوری واتاگۆڕێ ببینێ •••••• هەر بەو چەشنە لە زمانی فارسیی و ئینگلیزیی و ڕۆسیی و ئیتالیایی ••••• دا کار دەکات • لە زمانی چیکیدا هەردەم دەخرێتە سەر یەکەم بڕگەی وشە ؛ لە زمانی پۆلۆنیدا هەمیشە دەکەوێتە سەر بڕگەی پێش کۆتایی ؛ لە زوربەی زمانە تورانییەکاندا لەسەر دوا بڕگە دادەنرێ •••••

لە زمانی کوردیدا ، جگە لە هێزی وشە ( Word — stress ) واتـە ئـەوەی لـە سـەرەوە لێـی دواین ، هـەروەها هێـزی ڕستـە ( Phrasal Stress ) ش هەیە[٨٣] •

(٨٢) لەو ڕایەدام ، کە لە زمانی کوردیدا هێز دەکەوێتە سەر بزوێن ••••• ئەمەش ڕای زوربەی کوردناسـانە . مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانیش لە کتێبی ناوبراودا (ل ٤١ ــ ٤٢) پەنجەی بۆ ئەو ڕاستییە ڕاکێشاوە... هەرچی مامۆستا مەسعود محەمەدە بە وتاری باس کراویدا وا دەردەکەوێ، لەسـەر ئەو ڕایـە بێت کە لـە زمانی کوردیـدا هێز دەخرێـتە سەر کۆنسۆنانت .

(٨٣) بۆ باسی هێزی ڕستە ، بڕوانە : ل ٧٣ی ئەم کتێبە .

# واتــاگۆڕێ

کاتێ باسی خاسیەتی چۆنیەتی پێکهاتنی دەنگەکانی زمانی کوردیێ دێتە گۆڕێ ، پێویستە ئەوە بچەسـپێنرێ و بسـەلمێنرێ ، کـە بـە چ ڕێگە و وەسیلەیەکی فۆنەتیکـێ و لـە چ بارێکدا و بـە چ شـێوە و جـۆرێك دەتوانرێ دەربىڕرێـن • هەروەها پێویسـتـە سنور بۆ بچوکتـرین دانەی واتادار دابنرێ •

ڕێگەی هـەرە ئاسان و ئاشکرا بۆ نیشاندان و ڕونکـردنەوەی ئەو جیاوازییەی لە نێوان دەنگەکانی زمانـدا هەیە و لە جیاکردنەوەی مانا و واتادا دەور دەبینێ ــ بەرامبەر دانان و ڕاگرتنی دوێ یاخود پتر وشەیە ، کە بە مانا و واتا جودا و جیاواز بن و ، لە هەموێ شێوە و بارێکی فۆنەتیکەوە وێك بچن ، بـەلام تەنها لە یەك دانەی دەنگی ( فۆنێم )دا جیـاواز بن • بە وێنە ، لەم وشانەدا : **« بان ــ پان ، بار ــ پار ، بەز ــ پەز »** ، کە تەنیا دەنگی **( ب )** و **( پ )**یان جودایـە ، ئـەوە نیشـان دەدا کـە دەوری جیاکردنەوەی وشە دەبینن • لە زانستی دەنگناسیشدا ، بەم جیاکردنەوەیە دەڵێن ــ « واتاگۆڕێ » •

لە زمانی کوردێدا واتاگـۆڕێ فۆنەتیکێ لـەم ڕێگایانەی خوارەوە دەبێ :

**١ ــ دەنگەکانی ئاخاوتن :**

جیاوازێ نێوان وشەکانی زمـان لە زۆر حاڵەتدا وەنەبێ لـە ڕێگەی چەند دەنگێکەوەبێ ، بەڵکـو تەنها بەیەك دەنگە • بۆ نمـونە ، جیاوازێ وشەی **« باڵ »** لەگەڵ وشەی **« ساڵ »**دا تەنیـا لە دەنگـی یەکەمدایە و ؛ جیاوازێ لەگەڵ وشەی **« بێڵ »** لە دەنگی دووەمدایە ؛ لەگەڵ وشـەی

« **بار** »یش لە دەنگی سێیەمدایە • هەروەها لە وشە دروست بوندا زیادێ و کەمێ دەنگێك دەور دەبینێ ، بە وێنە ، وەك :

**( بەزم ) ـ ( بەز ) ، ( فشار ) ـ ( شار )** .

یاخۆ ئەنجامی جێگە گۆڕینی دەنگ دەبێ بە هۆی دروست بونی وشەی جیاواز ، وەك : **( باز ) ـ ( زاب ) ، ( ماش ) ـ ( شام )** . . . . . هتد .

**٢ ـ هێز ( النبرة ـ Stress )**

**( ا ) هێزی وشە ( Word — stress )**

زۆر جار هێزی وشە دەبێتە هۆ بۆ جیاکردنەوە و کێشانی سنوری وشە • بۆ نمونە : « **کوبونەوە** » •

١ ــ ئەگەر هێز بخرێتە سەر دوا بڕگە ، ئەوە دەبێتە چاوگ و مانای ( الاجتماع )ی عەرەبێ دەبەخشێ •

٢ ــ خۆ بێت و هێز لەسەر بڕگەی یەکەم دابنرێ ، ئەو دەم دەبێتە کاری ڕابردوی کۆ و مانای ( اجتمعوا )ی عەرەبێ بە دەستەوە دەدات •

**(ب) هێزی ڕستە Phrasal Stress**

گەلێك جار ، وا ڕێ دەکەوێ کە هێزی ڕستە ، یەك ڕستە بە چەند مانایەکی جیاواز دەردەبڕێ ( لەگەڵ ئەوەشدا ، کە بە گوێرەی دەنگەکان و هێزی وشە وەك یەکن و جیاوازییان لە نیواندا نییە ) • بە وێنە لە ڕستەی پرس ( الجملة الاستفهامية )ی ــ « **مامم هات ؟** »دا ، ئەگەر هێزی ڕستە بەسەر وشەی « **مام** »ەوە بێت ، ئەوە پرسیاری کەسێك نیشان دەدا • بەڵام ئەگەر هێزی ڕستە لەسەر وشەی « **هات** »

دابنرێ ، ئەو کاتە هەواڵی ڕوداوێك یاخود کارێك دەپرسرێ[٨٤] •

**٣ ــ ئاواز ( نغمة الكلام Intonation )**

بێ ئەوەی هێزی ڕستە شوێنی خۆی بگۆڕێ ، ئاوازیش دەتوانێ مانای ڕستە جیابکاتەوە • بۆ نمونە ، ڕستەی خەبەری ( الجملة الخبرية ) ــ « **شیرین گەڕایەوە** » و ، ڕستەی پرسی ( الجملة الاستفهامية ) ــ « **شیرین گەڕایەوە ؟** » ئاشکرا دیارن و گوێگر ئەم دو ڕستەیە تێکەڵ ناکا و وەك یەك وەریان ناگرێ ، ئەویش بە هۆی ئەوەوەیە ، کە وا ڕستەی یەکەم ــ واتە « **شیرین گەڕایەوە** » ئاوازێکی نزمی هەیە ، بەڵام ڕستەی دووەم ــ « **شیرین گەڕایەوە ؟** » بە ئاوازێکی بەرز دەردەبڕێت •

بەم باسەی سەرەوەدا ئەوەمان بۆ ڕون بووەوە کە هۆیەکانی واتاگۆڕێ ( دەنگەکانی ئاخاوتن و هێز ــ هێزی وشە ، هێزی ڕستە ــ و ئاواز )ن •

★ ★ ★

---

(٨٤) شایانی باسە ، مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی لە لاپەڕە ( ١٩ ، ٤١ ، ٤٧ ــ ٤٨ )ی کتێبی ناوبراودا لە هێزی وشە و هێزی ڕستە دواوە و ژمارەیەك نمونەی جوان و لەباری هێناوەتەوە .

# فەرهەنگۆك *

| | | |
|---|---|---|
| ئاسۆیی | الافقي | Horizontal |
| ئاواز | نغمة الكلام | Intonation |
| ئاوازەدار | المجهور | Voiced |
| ئەستوونی | العمودي | Vertical |
| ئەندامی ئاخاوتن | عضو النطق | Organs of speech |
| ئەوك | الحنجرة | Throat |
| - ئەوکی | الحلقي | Glottal |
| بڕگە | المقطع | Syllable |
| - بڕگەی داخراو | المقطع الساكن | Closed syllable |
| - بڕگەی کراوە | المقطع المتحرك | Open syllable |
| - بڕگەی هێزدار | المقطع المنبور | Stressed syllable |
| بزۆز | المتحرك | Active |
| بزوێن | حروف العلة | Vowels |
| - بزوێنی درێژ | المد | Long Vowel |

* ژمارەیەك زاراوەی زمان ، بەتایبەتی ئەو زاراوانەی لە باسی فۆنەتیکدا بەکار دەهێنرێن ، لەم کتێبەدا بەر چاو دەکەون ...... لەبەر چەند هۆیەکی ئاشکرا ، بە پێویستمان زانی ئەو زاراوانە کۆبکەینەوە و وەك فەرهەنگۆکێك لە پاشکۆی ئەم کتێبەدا بلاویان بکەینەوە .

لە نوسینی ئەم کتێبەدا کێشەی زاراو زەحمەتێکی گەورە و کارێکی دژوار بو . سەرەڕای هەوڵ و کۆششێکی زۆر لەو بارەیەوە ، گومانمان نییە کەم و کورتی و ناتەواوی تێدایە . ئەو زاراوەی زوتر دانرابو و بەلامانەوە لەبار و ڕەسەن بو وەرمان گرت . ئەوەش کە نەبو ، یاخود هەبو بەلام بە ڕای ئێمە جوان و گونجاو نەبو ، ئەوە بە سەلیقە و لێکدانەوە و بە شوێندا گەڕان جێگەیمان پڕکردەوە .

بێگومان دەزانین هیچ کارێك ، بەتایبەتی کاری سەرەتایی و تازە ، بێ کەم و کورتی نابێ و دور نییە لە هەڵبژاردن و داڕشتن و دۆزینەوە و دانانی ئەو زاراوانەدا توشی هەڵە بوبین . جا لەبەر ئەوەی ئەو هەڵەیە نەبێتە هۆی تێنەگەیشتن لە باسەکە ، بۆیەکا لە زۆر شوێندا بەرانبەر بە زاراوە کوردییەکە عەرەبی و ئنگلیزییەکەیمان داناوە .

| | | |
|---|---|---|
| Diphthong | ادغام حرفي علة | ـ بزوێنی دوّلانه |
| Triphthong | الطليق الثلاثي | ـ بزوێنی سێلانه |
| Short vowels | الحركة | ـ بزوێنی کورت |
| Bronchial tubes | الشــعبة | بۆريچه |
| Windpipe | القصبة الهوائية | بۆرێ هەوا |
| The Nasal Cavities | الخيشوم | بۆشایێ لوّت |
| Nasal | الانفي ، الخيشومي | بێقلۆك |
| Gum | اللثــة | پوّك |
| Letter | الحرف | پیت |
| Assimilation | المماثلــة | تواندنەوه |
| Plosive | الانفجاري | تەوژمۆك |
| Fricative | الاحتكاكي | خشوّك |
| The teeth | الاســنان | ددان |
| Sound | الصوت | دەنگ |
| Pronunciation | التلفظ | دەربڕین (*) |
| Phonetician | عالم الصوت | دەنگناس |
| Vocal Chords | الاوتار الصوتية | دەنگەژێ |
| Sentence | الجملــة | ڕســته |
| Interrogative sentence | الجملة الاستفهامية | ـ ڕستەی پرس |
| Affirmative sentence | الجملة الخبرية | ـ ڕستەی خەبەرێ |
| The central nervous system | الجهاز العصبي المركزي | ڕشــتەی دەمــارانی ناوەندێ |
| Organs windpipe | الجهاز التنفسي | ڕشتەی هەناسه |

* وەك لە سەرەوە باسمان کرد ، لە نۆسینی ئەم کتێبەدا کێشەی زاراو زەحمەتێکی گەورە و کارێکی دژوار بۆ . بە وێنە یەکێك لەو زاراوانەی گەلێك لەگەلی خەریك بـوّم ، زاراوی ( تلفظ ) بۆ ...... هەرچەندە هەندێ کەس وشەیان بۆ دیوەتەوە ، وەك ( گۆکردن ، بێژان ...... ) و ئێمەش لەم نۆسینەماندا ناچار بۆین بۆ ئەو مەبەستە چەند وشەیەك ، وەك ( دەربڕین ، وتن ، بە دەمدا هاتن ، تلفظ کردن ...... ) بەکار بهێنین ، بەلام ئەوەی ڕاستێ بێ ئەوەیە ، کە نە ئەوانەی خەلکێ و ، نە ئەوانەی خۆمان ، بە لامانەوە ڕەنگە پڕ بەپێستی مەبەست نەبن و بەبەر واتاکانیان زۆر چەسپ نەبن .... بەلکو زانایان و ڕۆناکبیرانی کورد وشەیەکی لەوانە جوانتر و ڕەسەنتر و لەبارتری کوردیـان بەرانبەر بـە ( تلفظ ) پێ شك بێ .

| | | |
|---|---|---|
| Resonant | الرنـــان | زرينگۆك |
| The Tongue | اللســـان | زمـــان |
| Uvula | اللهـــاة | ـ زمانه بچكۆله |
| Tip of the Tongue | طرف اللســـان | ـ سەری زمان |
| Language | اللغــة | زمـــان |
| Linguist | عالم اللغــة | ـ زماناس |
| Lingual | الأسلي | زوانەكی |
| The lung | الرئــة | ســـی |
| Allophone | نمـــط الفونيم | شێوەی فۆنێم (*) |
| Dependent ( conditioned ) Allophone | نمـــط الفونيم الشرطي | ـ شێوەی فۆنێمی پەیوەند |
| Phonetics | علم الأصوات | فۆنەتیك |
| Phoneme | الوحدة الصوتية | فۆنێم |
| Thorax | قفص الصدر | قەفەزی سنگ |
| Voiceless | المهموس | كپ |
| Cartilage, Gristle | الغضروف | كرکڕاگە |
| Obstruent | المعوق | كۆسپەك |
| Consonants | الحروف الصحيحة | كۆنسۆنانت |
| Noisy | ذو جلبـــة | گڤۆك |
| Vibrant | الاهتزازي | لەرۆك |
| The lips | الشـــفة | لێـــو |
| Labial | الشفوي | ـ لێوەكی |
| Muscle | العضلـــة | ماسۆلكە |
| Brain | الدمـــاغ | مێشك |
| Diaphragm | الحجاب الحاجز | ناوپنچك |
| Semi — vowel | نصف الطليق | نیمچە بزوێن |
| Word | الكلمـــة | وشـــە |

---

* هەروەها ئەوەش دەخەینە پێش چـاو خوێنەرانی بەڕێز ، كە بەرانبەر هەندێ زاراوی ئینگلیزیی ، عەرەبییەكەیمان بۆ نەدیتراوەتەوە ، لەبەر ئەوە ناچار بوین خۆمان بۆی دارێژین ، كە ئەمەش ڕەنگە كارێكی زۆر لەبار نەبێ . وەك ( نمط الفونيم ـ Allophone ) ، ( المعوق ـ Obstruent ) ( ذو جلبـــة ـ Noisy ) ، ( المقطع المنبور ـ Stressed Syllable ) ..... هتد .

| | | |
|---|---|---|
| هێــز | النبرة | Stress |
| ـ هێزی ڕسته | نبرة الجملــة | Phrasal stress |
| ـ هێزی وشه | نبرة الكلمــة | Word stress |

★ ★ ★

# سەرچاوە

## بە زمانی کوردی


(١) د. پاکیزە ڕەفیق حیلمی ، لە کوێوە دەست بکەین بە دەستوور سازی ڕێزمانی کوردی ، بەشی یەکەم ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ١ ، ژ ١ ، ١٩٧٣ ، ل ١٨٠ ــ ٢١١ ، بەشی دووەم ، هەمان گۆڤار ، ب ٢ ، ژ ١ ، ١٩٧٤ ، ل ٢٢٤ ــ ٢٦٢ .

(٢) د. پاکیزە ڕەفیق حیلمی ، بۆژاندنەوەی زمان ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد» ، بەرگی سێیەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ١٤٣ ــ ١٩٧.

(٣) تۆفیق وەهبی ، خوێندەواری باو ، بەغدا ، ١٩٣٣ .

(٤) ڕەئوف ئەحمەد ئالانی ، پیتی ( ی ) لە کوردیدا ، ڕۆژنامەی «ژین» ، ژ ٥، ١٩٧١ ، ل ٢ .

(٥) ع. ع. شەونم ، بەیان ، ژ ٢ ، ١٩٧٢ ، ل ٣٢ ــ ٣٦ .

(٦) طاهر صادق ، ڕێنووس . چۆنیەتی نووسینی کوردی ، کەرکوك ، ١٩٦٩ .

(٧) د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ ، زمانی ئەدەبی یەکگرتوی کوردی ، بەغدا، ١٩٧١ .

(٨) د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ ، دیالێکتەکانی زمانی کوردی و گیروگرفت و چارەسەر کردنیان ، گۆڤاری « پەروەردە و زانست » ، ژ ٦ ، ١٩٧٣ ، ل ٨٥ ــ ١٠٢ .

(٩) ق. کوردۆ ، زمانی کوردی ، یەریڤان ، ١٩٧٠ .

(١٠) کۆڕی زانیاری کورد ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ١ ، ژ ١ ، ڕێنووسی کوردی ، ل ٣٦٤ ــ ٣٧٩ .

(١١) کۆڕی زانیاری کورد ، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد»،ب٢،ژ ٢،لیستەی سێیەمی زاراوەکانی کۆڕ (زاراوی پزیشکی) ، ل ١٨٨ ــ ٢١٨ ؛ لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ (زاراوی زمان) ، ل ٥٠٦ ــ ٥٢٠ .

(١٢) محەمەد ئەمین هەورامانی ، تەماشا کردنێکی سەرپێیی زاری سۆرانی و زاری هەورامی ، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد» ، بەرگی دووەم ، بەشی دووەم ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ١١٧ ــ ١٦٥ .

(١٣) محەمەد ئەمین هەورامانی ، فۆنەتیکی زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٤ .

(١٤) محەمەد ئەمین هەورامانی ، سەرەتایێك لە فیلۆلۆژی زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٤ .

(١٥) مەحمود زامدار ، دەنگ یا تیپ ، گۆڤاری ، «بەیان»، ژ ٢، بەغدا، ١٩٧٢، ل ٤٠ ــ ٤٤ ( لــە گۆڤــاری « الاجیــال »ی مانگی نیســانی ١٩٧١ەوە وەرگێڕاوە و دەسکاریەکی زۆری کردوە ) .

(١٦) مەسعود محەمەد ، بەکارهێنانی (ی) لە ڕێزمانی کوردیدا ، «گۆڤــاری کۆڕی زانیاری کورد» ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٣٩ ــ ١١٤ .

(١٧) مەسعود محەمەد ، فۆنەتیك چیمان بۆ بکا ؟ ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد» ، بەرگی سێیەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٥٦٨ ــ ٦٢٢ .

(١٨) د. نەسرین فەخری ، پاشگری (اندن) لە زمانی کوردیــدا ، «گۆڤــاری کۆڕی زانیاری کورد» ، بەرگی سێیەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٢٠٧ ــ ٢٠٨ .

(١٩) نوری عەلی ئەمین ، ڕێزمانی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ .

(٢٠) نوری عەلی ئەمین ، ڕابەری بۆ ئیملای کوردی ، بەغدا ، ١٩٦٦ .

(٢١)

Mîr Hereqol Azîzan, Rêzana Elfabêya Qurdi, çapxana Tereki, Şam, 1932.

(٢٢)

Reşîd Kurd, Rêzmana Zimanê Kurmancî, Şam, 1956.

### بە زمــانی عەرەبی

(٢٣) د. ابراهيم أنيــس ، الأصوات اللغوية ، الطبعة الرابعة ، القاهرة ، ١٩٧١ .

(٢٤) ابو الفتح عثمان بن جنى ، الخصائص ، الجزء الثاني ، القاهرة ، ١٩٥٥ .

(٢٥) توفيق وهبى ، قواعد اللغة الكردية ، الجزء الاول ، بيروت ، ١٩٥٦ .

(٢٦) الشيخ كاظم الحلي ، علــم التجويــد ، الجــزء الاول ، الطبعــة الاولى ، كربلاء ، ١٩٦٤ .

(٢٧) كمال مظهر احمد ، حول مشاكل دراسة تاريخ الشعب الكردي ومهمات المجمع العلمــي الكردي ، « مجلــة المجمــع العلمي الكردي » ، المجلد الثاني ، العدد الثاني ، بغداد ، ١٩٧٤ ، ص ٢٩١ ــ ٢٩٩ .

(٢٨) د. محمد احمد ابو الفرج ، المعاجم اللغوية ، بيروت ، ١٩٦٦ .

(٢٩) محمد الانطاكي ، الوجيز في فقة اللغة ، حلب ، ١٩٦٩ .
(٣٠) محمود سيبويه احمد البدوي ، الوجيز في علم التجويد ، (محاضرات) ، بغداد ، ١٩٧٠ .
(٣١) منير البعلبكي ــ «المورد» قاموس انكليزي ــ عربي ، بيروت ، ١٩٧٢ .

## به زمـانی ڕۆسی

(٣٢) ئۆ. س. ئاخمانۆڤا ، فەرهەنگی زاراوەکانی زمان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ .
(٣٣) ئی. م. ئۆرانسکی ، زمانە ئێرانییەکان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٣ .
(٣٤) ێ. ف. ئۆرلۆڤا ، دەربارەی هەست کردنی دەنگ ، کتێبی : «پێشکەوتنی فۆنەتیکی زمانی ڕۆسی ئەمڕۆ» ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل ١٤٤ ــ ١٥٥ .
(٣٥) ك. ئەیوبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، دیالێکتی کوردی موکری ، لێنینگراد ، ١٩٦٨ .
(٣٦) چ. خ. باکایێڤ، بەشە دیالێکتی کوردی تورکمەنستان، مۆسکۆ، ١٩٦٢،
(٣٧) چ. خ. باکایێف ، زمانی کوردەکانی ئازربایجان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٥ .
(٣٨) چ. خ. باکایێف ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ .
(٣٩) ف. ئا. ترۆ فیمۆف ، زمانی ئەدەبی ڕۆسی ئەمڕۆ (فۆنەتیك و ڕێنۆس) ، لێنینگراد ، ١٩٥٧ .
(٤٠) خالیدی چەتۆ ، کوردی ئەرمەنستانی سۆڤێت ، یەریڤان ، ١٩٦٥ ، ل ١١٦ ــ ١٢٠ .
(٤١) ئا. ئا. ڕیفۆرماتسکی ، فۆنەتیکی بێ‌یاسا ، «پێشکەوتنی فۆنەتیکی زمانی ڕۆسی ئەمڕۆ» ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ،
(٤٢) ئا. ئا. ڕیفۆرماتسکی ، سەرەتایێکی زمانناسی ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ، ١٩٦٧ .
(٤٣) ئا. م. زیمسکی ، س. ێ. کرۆچکۆف ، م. ف. سڤێتلایێف ، زمانی ڕۆسی ، بەرگی یەکەم ، چاپی حەوتەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ .
(٤٤) س. ن. سۆکۆلۆف ، زمانی ئاوێستا ، مۆسکۆ ، ١٩٦١ .
(٤٥) ف. س. سۆکۆلۆڤا ، بەلگەی نوێ لە فۆنەتیکی زمانە ئێرانییەکاندا ، «زمانە ئێرانییەکان» ، مۆسکۆ ، ١٩٥٠ ، ب ٢ ، ل ٥ ــ ٢٨ .
(٤٦) ف. س. سۆکۆلۆڤا ، لە بارەی فۆنەتیکی زمانە ئێرانییەکانەوە ، مۆسکۆ ــ لێنینگراد ، ١٩٥٤ ، ل ٧٨ ــ ١٠٣ .

(٤٧) ن. س. ڤالگینا ، د. ئێ. ڕۆزێنتـــال ، م. ئـــی. فۆمینـــا ، ڤ. ف. تساپکێڤیچ ، زمانی ڕۆسی ئەمڕۆ ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ، ١٩٧١ .
(٤٨) گ. ئا. کلیمۆڤ ، فۆنێم و مۆرفێم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ .
(٤٩) ق . کوردۆ ، ڕێزمانی زمانی کوردێ ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ .
(٥٠) ق. کوردۆ ، زمانی کوردێ ، مۆسکۆ ، ١٩٦١ .
(٥١) ق. کوردۆ . بەراورد کردنی ڕێزمانی زمانی کوردێ (کرمـــانجێ ژۆرۆ و خوارۆ ) . ( نامەی دوکتۆرییەکەیەتی کە لە ســـالّی ١٩٦٢دا دوکتۆرای علومی پێ وەرگرتووە) .
(٥٢) ئا. ن. گڤۆزدێڤ ، زمانی ئەدەبێ ڕۆسی ئەمڕۆ ، بەرگی یەکەم ، چـــاپی سێیەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ .
(٥٣) ئا. ئی. مەیسـیێڤ ، پیت و دەنگ ، لێنینگراد ، ١٩٦٨ .
(٥٤) ب. ڤ. میللیر ، لە بارەی هەندێ کێشـەی فۆنەتیکی کوردییەوە . کتێبی «زمانە ئێرانییەکان»، ب ٢ ، مۆسکۆ ـ لێنینگراد، ١٩٥٠، ل ٦١ ـ ٦٧ .
(٥٥) ڤ. ن. یارخۆ ، ڤ. ئی. لۆبـۆدی ، زمـــانی لاتینێ ، چـــاپی دووەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٩ .
(٥٦) س. ئا. یەگیزارۆڤ ، مێژۆیەکی ئەتنۆگرافێ کورتی کوردی پارێزگـــای یەریڤان ، «هەوالّەکانی لقی قەفقاســـیای کۆمـــەلّی جـــوگرافێ ڕۆسێ ئیمپراتۆری» ، تفلیس ، ١٨٩١ ، ب ١٣ ، ژ ٢ .

## بە زمـــانە ڕۆژئاواییەکان

(٥٧)
Celadet Bedir — Khan, Grammaire Kurde, Paris, 1953.

(٥٨)
Emir Djeladet Bedir Khan et Roger Lescot, Grammaire Kurde ( Dialecte kurmandji ), Paris, 1970 .

(٥٩)
L. O. Fossum, A practical Kurdish grammar, Minneapolis, 1919.

(٦٠)
R. F. Jardine, Bahdinan Kurmanji; Grammar of the Kurmanji of the Kurds of Mosul division and surrounding districts of Kurdistan, Baghdad, 1922.

(٦١)
F. Justi, Kurdishe Grammatik, S - bg., 1880.

(٦٢)
Prof. Dr. J. Laessoe, An Old — Babylonian Archive Discovered Tell Shemshara.
مجلة «سومر» ، المجلد الثالث عشر ، بغداد ، ١٩٥٧ ، ص ٢١٦ ــ ٢١٨ .

(٦٣)
Prof. Dr. J. Laessoe, The Second Shemshara Archive.
مجلة «سومر» ، المجلد السادس عشر ، بغداد ، ١٩٦٠ ، ص ١٢ ــ ١٩ .

(٦٤)
D. N. Mackenzie, Kurdish Dialect Studies, London, 1961.

(٦٥)
Maurizio Garzoni, Grammatica e vocabolario della linqua Kurda, Roma, 1787.

(٦٦)
E. Prym and A. Socin, Kurdische Sammlungen, Abt l. ll, S. pbg., 1887 — 1890.

(٦٧)
E. B. Soane, Grammar of the Kurmanji or Kurdish Language, London, 1913.

(٦٨)
E. B. Soane, Elementary Kurmanji Grammar, Baghdad, 1919.

★ ★ ★

# پێداچوونەوە

خوێنەرانی بەڕێز !

تکایە بەر لە خوێندنەوە ئەم چەند هەڵەیە ڕاست بکەنەوە .

ل ٢٤ ، دێڕ ١٣ ـ ( الحروف العلة ) بکرێتە ( حروف العلة ) .

ل ٢٦ ، دێڕ ١٦ ـ ( بزوێنەکانی ڕیزی پشتەوە ) لە جێی ( دەنگەکانی ڕیزی پشتەوە ) دابنرێت .

ل ١٧ ، دوا دێڕ ـ وشەی ( ئەکەوە ) بکرێتە ( ئەوکەوە ) .

★ ★ ★

لەو شوێنانەدا کە ئەلفوبێی لاتینیمان تێدا بەکار هێناوە ، لەبەر نەبوونی پیتی ( چ ) و ( ش )ی لاتینی لە چاپخانەی کوڕ ، ناچار بووین بۆ نیشان دانیان خەت لە ژێر ( c ) و ( s )دا دابنێین ، تا لەگەڵ (ج) و (س)دا تێکەڵ نەبن ... جا تکامان لە خوێنەرانی بەڕێز ئەوەیە ، وا تێنەگەن ویستوومانە شتێکی نوێ لە ئەلفوبێی لاتینیدا بێنینە کایەوە .

# ناوەرۆك

لاپــەڕە

